# بنچینەی دەنگسازی



# لە ڕێزمانی کوردیدا

پرۆفیسۆر

**د. شـــێرکۆ بـابـــان**

کۆلێجی ئەندازیاری / زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

هەولێر ٢٠١٥

- ناوی کتێب:  بنچینەی دەنگسازی لە ڕێزمانی کوردیدا
- ناوی نووسەر: پ. د. شــێرکۆ بــابــان
- بابەت: تیۆری دەنگسازی
- تیراژی ( ٣٠٠) دانە
- دیزاین: دەزگای گۆڤار بۆ چاپ بڵاوکردنەوە (ماهر موعین مستەفا) - (٠٧٥٠٣٨٥١٦١١)
- چاپی یەکەم / ٢٠١٥
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٤٣٢) ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە .






Mob: 07504456297 - 07503851611
Email:mnara.mpp99@yahoo.com
mmmbabaxosh@gmail.com

## لیستی هێماکان

| | |
|---|---|
| فۆنیمی (نەبزوێن) | C |
| هێمای فۆنیم | /-/ |
| وچانی دەنگسازی، سنووری بڕگەیی | \| |
| کرۆکی بڕگە (جووتەدەنگ) | \|C^V\| |
| نیمچەبڕگە لە گیرفانی نووک (گ ن)دا، لە بڕگەی لێکدراودا | c. |
| بڕگەی گرانی لێکدراو | c.CVcc |
| بڕگەی پڕی لێکدراو | c.CVc |
| بڕگەی سووکی لێکدراو | c.CVo |
| هێشووی نەبزوێن لە گیرفانی دامێن (گ د)دا | -cc |
| بڕگەی گران | CVcc |
| بڕگەی پڕ | CVc |
| بڕگەی سووك | CVc |
| هێمای نەبزوێنی سەرەکی نادیار (C) لە بڕگەی ناتەواودا | Q |
| بڕگەی گرانی ناتەواو | QVcc |
| بڕگەی پڕی ناتەواو | QVc |
| بڕگەی سووکی ناتەواو | QVo |
| فۆنیمی (بزوێن) | V |

**زاراوەکان**

| | |
|---|---|
| (خ ب) | خانەی (بزوێن) لە چێوەی بڕگەدا، وەك جێگەی بزوێنی /ا/ لە بڕگەی \|بژار\|دا |
| (خ ن) | خانەی (نەبزوێن) لە چێوەی بڕگەدا، وەك جێگەی نەبزوێنی /ژ/ لە بڕگەی \|بژار\|دا |
| (گ د) | گیرفانی دامێن، وەك جێگەی نەبزوێنی /ر/ لە بڕگەی \|بژار\|دا |
| (گ ن) | گیرفانی نووك، وەك جێگەی نەبزوێنی /ب/ لە بڕگەی \|بژار\|دا |
| بڕگەی ئاسایی | ئەو بڕگەیەی کە گیرفانی نووکی (گ ن) بەبێ بارگەیە، وەك (دە\|cVo، دەر\|cVc، دەست\|cVcc) |
| بڕگەی پڕی ئاسایی | ئەو بڕگەیەی کە لە بزوێنی سەرەکی و نەبزوێنی سەرەکی پێکهاتوە، بەڵام نەبزوێنێکی پەراوێزی هەڵ گرتوە لە گیرفانی دامێن (گ د)دا، وەك (دەر\|cVc) |
| بڕگەی پڕی لێکدراو | ئەو بڕگە پڕیە کە نەبزوێنێکی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا، بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.C)، وەك (بژار\|c.cVc) |
| بڕگەی پڕی ناتەواو | ئەو بڕگە پڕیە کە نەبزوێنی سەرەکی تێدا نیە و دەبێت بۆی پەیدا بکرێت، وەك پاشگری (ـەر\|QVc) |
| بڕگەی سووکی ئاسایی | یان (جووتەدەنگ)، واتە ئەو بڕگەیەی کە هەر لە بزوێنی سەرەکی و نەبزوێنی سەرەکی پێکهاتوە، وەك (دە\|cVo) |
| بڕگەی سووکی لێکدراو | ئەو بڕگە سووکەیە کە نەبزوێنێکی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا، بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.C)، وەك (برا\|c.cVo) |
| بڕگەی سووکی ناتەواو | ئەو بڕگە سووکەیە کە هەر یەك بزوێنی سەرەکی پێك هاتوە و داوای نەبزوێنی سەرەکی دەکات، وەك هەر بزوێنێك بە تەنها (بزوێن\|QVo) |
| بڕگەی گرانی ئاسایی | ئەو بڕگەیەی کە لە بزوێنی سەرەکی و نەبزوێنی سەرەکی پێکهاتوە، بەڵام دوو نەبزوێنی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی دامێن (گ د)دا، |
| بڕگەی گرانی لێکدراو | ئەو بڕگە گرانەیە کە نەبزوێنێکی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا، بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.C)، وەك (بنێشت\|c.cVcc) |
| بڕگەی گرانی | ئەو بڕگە گرانەیە کە نەبزوێنی سەرەکی تێدا نیە و دەبێت بۆی پەیدا بکرێت، |

| | |
|---|---|
| ناتەواو | وەك پاشگری (اند\|QVcc) |
| بڕگەی لێکدراو | ئەو بڕگەیەیە کە نیمچەبڕگەیەك هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا، وەك (فرۆ\|c.CVo، بژار\|c.CVc، بنێشت\|c.CVcc) |
| بڕگەی ناتەواو | ئەو بڕگەیەیە کە بزوێنی سەرەکی تێدا هەیە بەلام نەبزوێنی سەرەکی تێدا نیە، وەك (هەر بزوێنێك\|QVo، پاشگری ـەر\|QVc، پاشگری اند\|QVcc) |
| بزرۆکە | بزوێنی بزرۆکە، بزوێنێکی سرك و جینگزە، لە هەر جێیەکدا کە (نەبزوێن)یك لە تەنگژەدا بێت، پەیدا دەبێت و جووتەدەنگی بۆ دەرەخسێنێت. هەرکە تەنگژەکەیش نەما، وندا دەبێتەوە. ئەم بزوێنە ناتوانێت لە خانەی بزوێن (خ ب) دابمەزرێت، مەگەر گیرفانی دامێنی بارگەدار بێت، وەك (درِ\|CVc، بست\|CVcc) |
| بزوێنی سەرەکی (V) | ئەو بزوێنەیە کە سەری لکاوە بە کلکی نەبزوێنەوە و گشت دەنگە بزوێنەکان بریتین لە بزوێنی سەرەکی. |
| توانستی بزوێن | زەبری و بڕشتی بزوێن لە بنیادنانی بڕگەدا، یان Vowel Power |
| پەراوێزی بڕگە | هەردوو گیرفانەکەی بڕگە (گ د) و (گ ن) |
| جەمسەر | (سەر) یان (کلك)ی فۆنیم |
| جووتەدەنگ \|C^V\| | کرۆکی بڕگە، یان لکانی سەری بزوێن بە کلکی نەبزوێنەوە، جووتەدەنگ بە ڕاستەوخۆیی یەکسانە بە (بڕگەی سووکی ئاسایی) |
| خانەی بزوێن (خ ب) | خانەی دوایی لە چێوەی بڕگەدا، کە مۆڵگی بزوێنی سەرەکیە، بێگومان سەری ئەو بزوێنە لکاوە بە کلکی نەبزوێنی سەرەکیەوە |
| خانەی نەبزوێن (خ ن) | خانەی بەرایی لە چێوەی بڕگەدا، کە تەرخانکراوە بۆ نەبزوێنی سەرەکی، یان ئەو نەبزوێنەی کە سەری لکاوە بە سەری بزوێنەوە |
| خشتەك | خشتبڕ، قاڵب، قەپیلك، چێوەی یەکەی بڕگەیی |
| خلیسکەبزوێن | یان (نیمچەبزوێن) ئەو دەنگەی بزوێنەیە، کاتێك کە لکابێت بە کلکی نەبزوێنەوە پێناسەی بزوێنی وەر دەگرێت، ئەگەرنا وەر دەگەڕێت بە دیوی (نەبزوێن)دا و بەپێناسەی نەبزوێن سەودا دەکرێت |
| دەنگی خپ | ئەو دەنگە نەبزوێنە ڕەسەنەی نێو گیرفانی دامێن (گ د)، کە تەنها بە زەبری |

| | |
|---|---|
| | بزوێن لە (جووتەدەنگ)دا دەر دەکەوێتەوە، وەك دەنگی /ر/ لە نموونەی (بخەوە\|رە\|وە)دا. |
| زەبری بزوێن | توانست و وزەی بزوێن لە دامەزراندنی بنیادی ئەندازیاری بڕگەدا |
| چێوە | بنیادی رووتی بڕگە بەبێ فۆنیمی نیشتەجێ. |
| گیرفانی دامێن (گ د) | گیرفانی دوایی لە پەنای کلکی بزوێندا. |
| گیرفانی نووك (گ ن) | گیرفانی بەرایی لە بڕگەی لێکدراودا. |
| کرۆکی بڕگە | ئەو بزوێنەی کە سەری لکاوە بە کلکی نەبزوێنەوە و جووتەدەنگی دروست کردوە. |
| کریستاڵی جووتەدەنگ | گرێی جووتەدەنگ \|C^V\| |
| ناوگر | ئەو دەنگە نەبزوێنەی کە دەلکێت بە سەری بزوێنەوە و وزەکەی دەخواتەوە بە چێکردنی جووتەدەنگ. زمانی مرۆیی بە ئەم راستیە بنیادنراوە، بەلاّم ئەگەر سەرچاوەی ئەو دەنگە لێڵ بێت پێی دەڵێن (ناوگر)، هەرچەندە کە وا نیە. |
| نەبزوێنی پەراوێزی (c)، (سەربار) | ئەو نەبزوێنانەی کە لە گیرفانی خانەکاندان، نەك لە خانەکان خۆیاندا. |
| نەبزوێنی سەرەکی (C)، (بنەبار) | ئەو نەبزوێنەی کە کلکی لکاوە بە سەری بزوێنەوە. بێگومان، گشت دەنگە بزوێنەکان بریتی نین لە بزوێنی سەرەکی. |
| نیمچەبڕگە (.C) | بڕگەی بزوێنی بزرۆکە بە مەرجێك کە گیرفانی دامێنی (گ د) بۆش بێت. جۆرە بڕگەی ئاوها هەر لە گیرفانی نووك (گ ن)دا دەتوانێت بگوزەرێت، وەك دەنگی /ب/ لە ئەم بڕگانەدا (بنار، برۆ، بکەر، بنێشت، بلێ) |

# ناوەڕۆك

# گوتەیەک

یەکێک لە ئاکارەکانی زمانی کوردی ئەوەیە کە کێشەی بزوێنی زۆر تێدا هەیە و زۆربەی رەگەزە ڕێزمانیەکان زۆر ئاڵۆزن لە رووی دەنگسازییەوە، چونکە لە زۆر جێدا، بزوێنەکان لە یەکتری دەخشێن و ئارێشە دەنێنەوە و کارلێکی دەنگسازی پەیدا دەبێت و سەرلەنوێ پرۆسەی برگەوەرێژی دەهێنەوە ئاراوە. لە لایەکی ترەوە، کێشەی نیمچەبزوێن هەیە و ئەو کێشەیە بە شێوەیەکی داینامیکی دەچەسپێت. بۆ نموونە، جێناوی کەسی سێیەمی تاک (ی) لە یەک نیمچەبزوێن پێکهاتوە و ئەو دەنگە راوێشکەیەکی بەردەوام دەکات لە نێوان دیوی (بزوێن) دیوی (نەبزوێن)دا. بە واتایەکی دی، دەنگی /ی/ لە نموونەی (هێنای)دا لە دیوی (نەبزوێن)دایە، کەچی لە نموونەی (بردی)دا لە دیوی (بزوێن)دایە، هەرچەندە، هەردوو کارەکە تێپەڕن و جێناوەکەیش لە هەمان ئەرکی (بکەر)دایە. تەنانەت لە پەرێزی ئەو دوو کارەیشدا، ئەو جێناوە بۆی هەیە راوێشکە بکات، بۆ نموونە لە (هەڵی هێنا)دا لە دیوی (بزوێن)دایە، کەچی لە نموونەی (نەی هێنا)دا لە دیوی (نەبزوێن)دایە. واتە، لە هەمان کاردا دەنگی جێناوی /ی/ بۆی هەیە بە پێی جێیەکەی دیاردەی (نیمچەبزوێنایەتی) پیادە بکات. سەرەڕای ئەوە، لە زمانی کوردیدا، دەنگی خپ (silent) هەیە و دەنگی نیمچەخپ هەیە و ئەو دەنگانە زۆر بە چڕی و بە دژواری ڕێزمانەکە ئاڵۆز دەکەن و زۆر جار ڕێزماننووسنیش دەستی لێ دەپارێزن. لە روانگەی ئەم ئارێشانەوە، لە بەشی دووەمی کتێبی (دەنگسازی کوردی بە تیۆری زەبری بزوێن/٢٠١٤)دا، دوا ڤێرشنی (خشتەی لێکدانی بزوێن) بلاّو کراوەتەوە. ئەم خشتەیە (٦٤) خانەیە تێدایە و (٦٤) باری شیاوی تێدایە بۆ لێکخشان لە نێوان سەر و کلکی (٨) بزوێنەکەی زمانەکەدا. ئەمانە و بە کۆی گشتی ئەم ئارێشانە، زمانی کوردی بریتیە لە کێڵگەیەکی بەپیت و بەپێز بۆ بزافی توێژینەوەسازی لە بیاڤی دەنگسازی کوردی و دەنگسازی سەرتاسەریدا. لە ئەم روەوە، بایەخێکی بێ پایان دراوە بە تیۆری زەبری بزوێن (Vowel Power Theory)، واتە ئەو وزەیەی کە لە سەری فۆنیمی (بزوێن)دا هەیە لەبۆ جووتبوون بە کلکی فۆنیمی (نەبزوێن)ەوە، لە پێناوی بەرهەمهێنانی گرێی

(جووتەدەنگ)دا، بەڵام بە ئارەزووییەکی خۆڕسك و هاوبەش. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین کە زەبری بزوێن بریتیە لە بابەتێکی زۆر کاریگەر بۆ سەوداکردنی کێشەکانی دەنگسازی لە زمانی کوردیدا و لە گشت زمانەکاندا. بۆ نموونە، لە چەندین جێدا زەبری بزوێن ڕۆڵی بینیوە لە شیکاری گرێ کوێرەکاندا، تەنانەت لە چەندین نموونەدا ڕیزمانەکە هەر خۆی راست کردوەتەوە، چونکە ئەو زەبرە بە خورتی دەچەسپێت و بە ناچاری پیادە دەکرێت. لە بابەتی (ڕێزمانەکە خۆی خۆی راست دەکاتەوە)دا، هەرچەندە هەندێك نموونەی تێدا هەیە کە پەیوەندییان نیە بە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەوە، بەڵام زۆربەی زۆری نموونەکان بە (تیۆری زەبری بزوێن) یەکلایی کراونەتەوە. بێگومان، گشت ئەو بابەتانە دەبن بە کەرەستەیەکی بەکار و بلیمەت، چی بۆ ئارێشەکانی ڕێنووس و چی بۆ پوختەکردنی زمانی نووسین. لە لایەکی ترەوە، لە بانێژەی ئەم کتێبەوە، توێژەری زرنگ تێ دەگات، چۆن لە ساڵی (١٩٩٧)وە تێکۆشاوین و چەوساوینەتەوە لە دانانی (تیۆری زەبری بزوێن)دا، تا بە جوانترین شێواز بی خەینە بەردەستی هەموان، وەك لە ساڵی (٢٠٠٩)وە بە زمانی ئنگلیزی دەستمان کردووە بڵاوکردەوەی. تا ئێستا سێ زانای هەرەگەورە و خاوەن کتێبی بواری فۆنۆلۆژی بە (ئەرێنی) هەڵیان سەنگاندوە، وەك: (پیتەر ڕۆچ/ زانکۆی ڕێدینگ/ لەندەن، جۆن گۆڵدسمیس/ زانکۆی شیکاگۆ/ ئەمەریکا، رنێ کاگەر/ زانکۆی ئوترێخت/ هۆڵەندا). بە راستی، تیۆری زەبری بزوێن (Vowel Power Theory) جوانترین گوڵی زانستیە لە گوڵستانی دانراوەکانی ئێمەدا، کە لە بڵاوکراوەکانی نێوان (١٩٩٧-٢٠١٣)دا ئامادەمان کردوە و بە هەموو وردەکارییەکەوە، تا رادەی (دارماڵ) بە هەردوو زمانی کوردی و ئنگلیزی، خستوومانەتە بەردەستی توێژەران. لە پاشتردا، بۆ دەرخستنی کاریگەری زانستی، ئەو تیۆرییەمان بەکار هێناوە وەك کەرەستەیەکی دەستی بۆ یەکلایی کرنەوەی زۆر بابەتی ڕێزمانی بە شیکاری زانستی. بۆ نموونە، لە رستەی (من ڕۆیشتـ|مە|وە)دا، سەری بزوێنی /ـە/ بۆنی کلکی جێناوی (م) دەکات و دەی خاتە بەر زەبر و بە زۆر و زۆرداری جووتە دەنگی (مە) دروست دەکات، کەچی لە رستەی (من ڕۆیشتـموومە|تە|وە)دا، سەری بزوێنی /ـە/ بۆنی کلکی دەنگی خپی /ت/ دەکات و بە زۆر دەی خاتە بەر زەبر و جووتە دەنگی (تە) دروست دەکات. لە رستەی (من

ڕۆیشت|مە|وە)دا، سەری بزوێنی /ـە/ بۆنی کلکی جێناوی (م) دەکات و دەی خاتە بەر زەبر و جووتە دەنگی (مە) دروست دەکات، چونکە جێناوی (م) سادەیە و مۆرفیمی ئێستایی هەڵ نەگرتوە بە شاراوەیی. بەڵام لە ڕستەی (من ڕۆیشتمووم‌ە|تە|وە)دا، سەری بزوێنی /ـە/ بۆنی کلکی دەنگی /ت/ دەکات لە ژێر جێناوی (م)دا دەی خاتە بەر زەبر و جووتەدەنگێکی تر (تە) دروست دەکات و ناخشێت لە کلکی جێناوی (م)، چونکە چاوی بزوێنەکە کلکی دەنگی خپی /ت/ دەبینێت، بەڵام چاوی ئێمە زلکوێرە هەر کلکی جێناوی (م) دەبینێت. کەواتە، زەبری بزوێن دەبێت بە ئامێری شیکارساز بۆ دۆزینەوەی (مۆرفیمی نادیار)، بە سایەی بۆنکرنی دەنگی خپی /ت/وە. واتە، وەك دۆزینەوەی تەرمێکی کۆنی ژێرخاککەوتوو بە سایەی پارچە کانزایەکەوە. کەواتە، کرۆکی کێشەکە ئەوەیە کە (زەبری بزوێن) پارچە کانزاکە دەناسێتەوە و لە دەرئەنجامدا، ئێمە مۆرفیمەکە و جێگەی مۆرفیمەکە دەدۆزینەوە. لە بابەتەکانی نێو ئەم کتێبەدا، هەر لە نووکەوە (١٩٩٧)، تیۆری (زەبری بزوێن)مان بە کار هێناوە و کەڵکی گەورەمان لێ وەرگرتوە. تەنانەت لە ساڵی (١٩٩٩)دا، لە ژمارە (١٣٢)ی گۆڤاری (کاروان)دا، زاتی ئەوەمان کردوە کە نەترسین و دەست بکەینەوە و (میکانیزمی زەبری بزوێن) بکەین بە ناونیشانی نووسینێك، کە بریتیە لە (بەشی چوارەم) لە ئەم کتێبەی بەردەستدا. بە ڕاستی، ئێمە تێ ناگەین، دەنگسازان بە تایبەتی و ڕێزماننووسانی بە گشتی، چۆن بەبێ (تیۆری زەبری بزوێن) ئیش دەکەن، خۆ هیچ نموونەیەك نیە کە بە لای کەمەوە گرێیەکی (جووتەدەنگ)ی تێدا نەبێت، بەڵام ئەو گرێیە و هەر ژمارەیەکی تر لە گرێ، بە شێوەی هەندەسی، بە (زەبری بزوێن) مەییوە و بلووری بەستوە، لە سەر هێڵێکی تاکئاراستە. ئەی توێژەری ئازیز ئێمە بە ئەم توانستەوە زوومی توێژینەوەمان هێناوەتە نێو سیستەمی زمانەوە، ئەو سیستەمەی کە نەخشەکەی لە توونی بابا ئاڵۆزتر و پێچاوپێچتر‌ە، بەڵام هەر بریتیە لە سیستەمێکی نەخشەدار و نەخشە ڕێگای درشت و ورد و دەزوولەیی تێدایە. بە پێی زانیاری ئێمە (٢٠١٥/٦/٧)، ئەوەی ئێمە کردوومانە زۆر دەگمەنە، ئەگەر بۆ زمانێك کرابێت، بەڵام هەموو زمانێك کەم و زۆر وەك توونی بابا وایە و پێویستی بە چرای زەبری بزوێنە و پێویستی بە نەخشەی ڕێزمانی بوون و هەبوونە، بۆ پەی بردن بە

ڕێزمانەکەی. لە ئەم گۆشە نیگایەوە، ئێمە ڕێزمانی بوون و هەبوون بە شادەمار و بە شادەروازەی سیستمی ڕێزمان دەزانین و زەبری بزوێنیش بە چرایەکی دەستی بەکار دەزانین لە ئاستی هەر گرێکوێرەیەکی دەنگسازیدا. ئەمە و ئەی توێژەری ئازیز، ئەگەر لە بابەتەکە تێ نەگەیشتیت، وازی لێ بهێنە و دای بنێ بۆ ئەوەی پاشتر و پاشتر، چونکە زانست شەرم لە کەس ناکات، ڕۆژێك دا دەهێت کە ئەم زانستە لە ڕۆژئاواوە دەگەڕێتەوە و ئێوەیش لە قوژبنی کتێبخانەکاندا بۆ سەرچاوە کوردییەکەی دەگەڕێن. لە ئەو سەرچاوانەدا، ئێوە زانیاری پتەوتر و کاریگەرترتان دەست دەکەوێت، چونکە تیۆریەکە خۆماڵیە و لە زمانی کوردیەوە ڤاڵکراوە و بە نموونەی کوردی خاراندوومانە. لە گەڵ ئەوەیشدا، ئێمە کە دەچینە توونی سیستمی زمانەوە، وەك کارەبا بمان گرێت ئاگامان لە خۆمان نامێنێت و لە شکلیاتدا ڕەنگە هەڵە بکەین، بەڵام هەموو ئەو هەڵانە دەکەینە قوربانی کرۆکە زانستەیەکە. تەنانەت، هەر کاتێك کە ڕستەیەکی ڕەشنووس پاکنووس دەکەینەوە، جارێکی تر بەبێ ئاگایی دەچینەوە نێو کرۆکە زانسیەکە و لەوانەیە هەڵەیەکی تر بکەینەوە لە ڕوخساری ڕووکەشدا، نەك لە بنکەشی زانستیدا. هەر لە بەر ئەوە بمان بەخشن لە ئەو وردە هەڵانە.

بۆ زانین: لە پێداچوونەوەی ئەم بابەتەدا، کەڵك وەرگیراوە لە گشت کتێبەکانی خۆمان لە بواری دەنگسازیدا، کە بریتین لە (٤) کتێب بە کوردی، بە ژمارەکانی (١٠، ١٧، ٢٥، ٢٧) و (٧) کتێب بە ئنگلیزی، بە ژمارەکانی (١٦، ١٨، ١٩، ٢١، ٢٢، ٢٨، ٣٠)، لە لیستی کتێبە چاپکراوەکانی نووسەردا. لە ئەم (١١) کتێبەدا، تیۆری زبری بزوێن بریتیە لە ئەو کەرەستە زانستیەی کە گشت کێشەکانی پێ شیکراوەتەوە، چونکە فۆنیمی (بزوێن) بریتیە لە ژێدەری؛ (١): وزەی برگەڕێژکردنی ئاخاوتن، (٢): چێوەی یەکسانی برگەی ئاخاوتن، (٣): ڕێساکانی برگەڕێژکردنی فۆنیمە نەبزوێنەکان لە زنجیرەی گوفتاردا.

بەهیواین کە توانیبێتمان خزمەتێکی بچووك پێشکەش بکەین بە زمانە شیرینەکەمان و هەنگاوێکی تر نزیك ببینەوە لە چارەسەری کێشە ئاڵۆزەکانی، هەرچەندە ژینگەی توێژینەوەسازی لە شەوی ئەشکەوت تاریکترە و لە پشت هەر دەرگایەکەوە گابەردێك بوە بە لەمپەر.

# بابەتی یەکەم

# دەنگی خپ لە زمانی کوردیدا[1]

## ١:١- دەستپێك:

مەبەست لە (دەنگی خپ) ئەو دەنگەیە، کە هەیە و بەشێکە لە پێکهاتەی مۆرفیمێك، بەلأم گۆ ناکرێت، مەگەر لە ژێر (زەبری بزوێن)دا، واتە لکابێت بە سەری بزوێنێکەوە و وزەکەی دامرکاندبێت، بە دروستکردنی (جووتە دەنگ)ێك لە گۆکردندا. لە زمانەکەدا، هەندێك دەنگ دەردەکەوێت بۆ ناوگرایەتی. واتە، بۆ ئەو مەبەستەی کە ببێت بە (ناوگر)[2] لە نێوان دوو دەنگی بزوێندا کە دەخشێن لە یەکتری. لە ئەم روەوە، رێزماننووسان زۆر باسی ئەو ناوگرەیان کردوە، بەلأم بۆ ئەوە نەچوون کە (دەنگی خپ) هەیە لە زمانەکەدا. ئەو دەنگە نامێنێت لەسەر زار، کەچی لە ناخی بیردا دەپارێزرێت، تا ئەو کاتەی کە بزوێنێك دەخشێت لێی و دەی بووژێنێتەوە و دەی خاتەوە سەر زار. بۆ زانین، دەنگی ئاوەها لە زمانانی تریشدا هەیە، بۆ نموونە لە زمانی فەرەنسیدا هەیە و زۆرە، بەلأم رێنووس کراون[3]. واتە، لە ریزی نووسیندا دەبینرێن بەلأم لە ژینگەی تایبەتیدا دەخوێنرێنەوە، یان گۆ دەکرێن. سەبارەت بە زمانی کوردی، تا ئێستا (٢٠١٥) دوو دەنگی خپکراومان دۆزیوەتەوە و لە کتێبە بلأو کراوەکاندا باسمان کردوون، بەلأم لە ئەم نووسینەدا دەمانەوێت بە جوانی و بە فراوانی ئەو جۆرە دەنگانە وەدەر بخەین بۆ ئەوەی

---

[1] گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٦)، سالی ١٩٩٧، لاپەرە (٦٣-٦٥).

[2] زاراوەی (ناوگر) لەلای ئێمە نرخی گۆڕاوە، لە تیۆری زەبری بزوێندا ئەو ناوگرە لکاوە بە نووکی بزوێنی دوەمەوە و گرێی دەنگسازی بۆ جێکردوە. بزوێنی یەکەمیش لە پێشترا ئەو گرێیەی بۆ فەراهەم کراوە. لە کتێبی (برگەسازی کوردی لە تیۆری زەبری بزوێندا، هەولێر ٢٠١٤)، بەشی هەشتەم تەرخانکراوە بۆ ئەم بابەتە.

[3] لە زمانی فەرەنسیدا ئەو دەنگە خپانە دەنووسرێن، بەلأم لە ژینگەی تایبەتیدا بە (زەبری بزوێن) دەبووژێنرێنەوە و دەر دەکەون لە گوفتاردا.

هەموو کەسێك تێ بگات لە بابەتەکە. لە ئەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین ئەو دوو دەنگە خپە دیاری بکەین، کە بریتین لە:

یەکەم: دەنگی خپی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا (ـە).

دووەم: دەنگی خپی /ر/ لە جێناوی فەرماندا (ـە)، بۆ کەسی دووەمی تاك.

## ٢:١- دەنگی خپی /ت/[٤]:

مۆرفیمی ئێستایی[٥] بریتیە لە ڕێژەی ڕانەبردووی کاری (بوون)، کە بە ڕوونی لە جێی جێناوی کەسی سێیەمی تاك دەر دەکەوێت، کە نادیارە لە ئەو جۆرە ڕێژەیەدا. واتە، ئەگەر لە هەموو کاری زمانەکەدا جێناوی کەسی سێیەمی تاك، لە دەمکاتی ڕانەبردوودا، بریتی بێت لە (ێت)، لە کاری (بـوون)دا نادیـارە و مۆرفیمەکە لـە جێـی دانیشتوە. ئـەو ڕەگەزە ڕێزمانیە لە هەموو ڕێژەیەکی تێنەپەڕدا لە جێی جێناوی (بکەر) دەردەکەوێت و لە ڕێژەی تێپەڕدا لە جێی (بەرکار) دەردەکەوێت، ئەمەیش تەنها لە کاری (بوون)دا و لە ڕێژەی ڕابردووی تەواودا. سەبارەت بە ڕوخساری ڕەسەن، دەشێت ئەو ڕەگەزە بە شێوەی (ـەت) بێت، واتە لە دوو دەنگ پێکهاتبێت. دەنگی یەکەم بزوێنی /ـە/، کە ئاشکرایە لـە سەر زار، لەگەڵ دەنگی نەبزوێنی /ت/، بە خپی لە ناخی بیردا. بـەڵام ئـەگـەر دەنگێکی بزوێن بخشێت لە کلکی دەنگی /ـە/ لە لای چەپەوە، ئەوا لە ئەو شەڕەبزوێنەدا ژینگەیەك دروست دەبێت کە تێیدا دەنگە خپەکە دەبووژێتەوە[٦]، وەك:

یەکەم: خشان لە پاشگری دووپات کردنەوە (ەوە)، وەك:

[٤] مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە هەردوو کاری (بوون و هەبوون)دا هەیە. لە سەرچاوەی (٢)دا، لە کۆپلەی (٦٧)دا، بەکورتی باسی دەنگی خپ کراوە، لە ئەو دوو ڕەگەزەدا کە لە ئەم ئەم نووسینەدا جێی مەبەستن.

[٥] ڕیزمانی مۆرفیمی ئێستایی کراوە بە کتێبێکی سەربەخۆ بە ناوی (مۆرفیمی ئێستایی/ـە)، کە لە ساڵی (٢٠٠٦)دا، لەلایەن گۆڤاری (ئاسوی پەروەردەیی)ەوە بڵاو کراوەتەوە.

[٦] میکانیزمی بووژاندنەوەی دەنگی خپ لە ئەوەوە دەست پێ دەکات کە بڕگەیەکی ناتەواو هەبێت و ئەو بڕگەیە بە (بزوێن) دەست پێ بکات. جۆرە بڕگەی ئاوها بە هەموو نرخێك دەبێت دەنگێکی نەبزوێن پەیدا بکات بۆ ئەوەی مەرجی (گرێی جوتەدەنگ) بەدی بهێنێت لە گۆکردندا. مەرجیش نیە هەر دەنگێك دەربکەوێت دەنگی خپ بێت.

من گرتووم(ـە) + ەوە ← من گرتووم(ـەت)ـەوە

تۆ بردووت(ـە) + ەوە ← تۆ بردووت(ـەت)ـەوە

لە ئێرەدا، سەری دەنگی بزوێنی بەرایی /ە/، لە پاشگری (ەوە)، خشا لە کلکی ئەو ڕەگەزە و ئەو دەنگە خپەی دەرهێنا لە ناخی بیردا و هێنایە سەر لێو. واتە، ڕوخساری مۆرفیمی ئێستایی (ـە)ی گۆڕی بۆ (ـەت).

<u>دوەم</u>: ئامرازی پەیوەندی (ـە): ئەم ڕەگەزە لە بزوێنێک پێکهاتوە و هەموو کاتێک دەیەوێت جێوەکەی خۆی پڕ بکاتەوە، وەک:

کەوتو(ە) + ـە خوارەوە ← کەوتو(ەت)ـە خوارەوە

من بردووم(ـە) + ـە ئەوێ ← من بردووم(ـەت)ـە ئەوێ

تۆ بردووت(ـە) + ـە سەرێ ← تۆ بردووت(ـەت)ـە سەرێ

لە ئەم نموونانەیشدا، کاتێک کە سەری بزوێنی /ـە/ خشا لە مۆرفیمی (ـە) ژینگەیەک پەیدا بوو بۆ ئەوەی کە دەنگە خپەکە زیندوو ببێتەوە بۆ ناوگرایەتی لە ئەو شەڕە بزوێنەدا[7].

<u>سێیەم</u>: ئامرازی پەیوەندی (ێ): ئەم کەرەستەیە بریتیە لە لە دیوێک لە ئامرازی (پێ) و لە بەر ئەوەی لە بزوێنێک پێکهاتوە، دەتوانێت دەنگی خپ بدۆزێتەوە لە ناخی بیردا، وەک:

گەیشتو(ە) پێی ← گەیشتو(ەت)ـێ

داوت(ـە) پێی ← داوت(ـەت)ـێ

[7] بۆ جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە)، تەنهاٌ هەر ئەو سێ ئەندازە بەرچاویە هەن، کە بکەونە دیوی چەپی جێناوەکە (دیوی کلک)، بۆ زیندوو کردنەوەی دەنگە خپەکەی /ر/.

لە ئێرەیشدا، بە ئاشکرا دەنگە خپەکە /ت/ هاتەوە سەرلێو بۆ ئەوەی ببێت بە ناوبژیوان لە نێوان هەردوو بزوێنەدا. واتە، لکاوە بە سەری بزوێنی /ێ/وە و مگێزەکەی دامراندوە.
<u>چوارەم</u>: کاتێك کە جێناوی خاوەنێتی (ی) بەکار دەهێنرێت، وەك:

ئەو هاوتایـ(ـە) ← ئەو هاوتایە(ـەتـ)ـی

لە ئەم هەڵوێستەدا، جێناوی (ی) پاسابەزێنە و دەکشێت بۆ دواوە. بەڵام کاتێك کە چوە پاش مۆرفیمی /ـە/، ئەوا دەنگە خپەکە جارێکی تر زیندوو دەبێتەوە بۆ ناوگرایەتی. لە ئەو نموونەیەدا، ئەگەر جێناوی (ی) گۆڕا بە نەبزوێنێك، وەك جێناوی (م)، ئەوا دەنگە خپەکە نابووژێتەوە، وەك: (ئەو هاوتامە).
<u>پێنجەم</u>: بە تەریبی لەگەڵ خاڵی چوارەم، لە ڕێژەی (هەمە)دا، ئەگەر جێناوی (م) گۆڕا بە جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ی)، ئەوا ئەو جێناوە پاسابەزێنە باز دەدات بۆ پاش مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، وەك: (ئەو هەیـ|ـەتـ|ـی). لە ئەم هەلومەرجەیشدا، جارێکی تر مۆرفیمی ئێستایی بە ڕوخساری تەواوی (ـەت) دەردەکەوێتەوە.

تۆ بڵێیت! ئەم پێنج ئەندازە دەنگسازییە نەتوانن ببن بە بەڵگە بۆ هەبوونی دەنگی /ت/ لە ڕوخساری مۆرفیمی ئێستاییدا. تۆ بڵێیت! هێشتا گومان مابێت لە ئارادا، یان دەرگایەکی تر هەبێت کە دەنگی /ت/ی بەخشیبێت بە شەرمبزوێنەکە.

### ٣:١- دەنگی خپی /ر/:

جێناوی کەسی دوەمی تاك، لە ڕێژەی فەرماندا، بە ڕوخساری بزوێنی /ـە/ دەردەکەوێت، کەچی لە ڕەسەندا ڕوخسارە تەواوەکەی بریتییە لە (ـەر). واتە، لە دوو دەنگ پێکهاتوە، دەنگێکی ئاشکراو گۆکراو لەسەر زار /ـە/ و دەنگێکی خپ لە ناخی بیردا /ر/. ئەم دەنگەیش هەر وەك دەنگی /ت/ بە زەبری بزوێنی دانەمرکاو زیندوو دەبێتەوە، وەك:

**یەکەم: خشان لە پاشگری دووپات کردنەوە (ەوە)، وەك:**

**تۆ بکەو(ە) + ەوە ← تۆ بکەو(ەر)ەوە**

**تۆ بی نێر(ە) + ەوە ← تۆ بی نێر(ەر)ەوە**

**لە ئێرەدا، بۆ ئەوەی هەردوو بزوێنەکە لە یەکتری نەخشێن و کێشەیەکی دەنگسازی پەیدا نەبێت، ئەوا دەنگی خڕی /ر/ زیندوو دەبێتەوە و دەلکێت بە سەری بزوێنی /ـە/وە و وزەکەی دەمژێت و دای دەمرکێنێت.**

**دوەم: ئامرازی پەیوەندی (ـە)، وەك :**

**تۆ بکەو(ە) + ە دوای ← تۆ بکەو(ەر)ە دوای**

**تۆ بی نێر(ە) + ـە ئەوێ ← تۆ بی نێر(ەر) ە ئەوێ**

**بە ئاشکرایی، سەری وزەداری بزوێنی /ـە/ توانی دەنگە خڕەکە زیندوو بکاتەوە و روخساری تەواوی جێناوەکە دەبخات وەك (ەر).**

**سێیەم: ئامرازی پەیوەندی (ێ)، وەك:**

**بکە پێی ← بی گە(ەر)ێ**

**بی دە پێی ← بی دە (ەر)ێ**

**هەرچەندە دەنگی /ە/ ون بوە لە بنچی هەردوو کارەکەدا، بەلاّم کلکەکەی، کە بریتیە لە دەنگی خڕی /ر/، زیندوو بوەتەوە. لە ئەم روەوە، زۆرجار دەنگی یەکەم /ە/ نامێنێت،**

بەڵام ئەوە بە هیچ جۆرێك واتای ئەوە نابەخشێت کە دەنگی خڕی /ر/ نەمێنێت لە ئارادا، وەك دەگوترێت:

بشکێ + ەوە ← بشکێ|ر|ەوە
بسووتێ + ەوە ← بسووتێ|ر|ەوە
مەچۆ + ەوە ← مەچۆ|ر|ەوە

لە لایەکی ترەوە، لە زۆر جێدا، باری ڕێزمانی ئەو ڕستەیە لەنگ دەکرێت، بە چەشنێك کە دەنگی /ر/ گۆ نەکرێت:

بکە پێی ← بی گەیێ
بی دە پێی ← بی دەیێ
بشکێ + ەوە ← بشکێوە
بسووتێ + ەوە ← بسووتێوە
مەخۆ + ەوە ← مەخۆوە

ئێمە بە هیچ جۆرێك لە گەڵ ئەوەدا نین کە ئەم دیاردەیە بگات بە زمانی نووسین و دەبێت هەموو کاتێك فۆرم و ئەرکی ئەو جێناوە دەربخرێت لە ڕێژەی فەرماندا. یان، بە هیچ جۆرێك وا نەکرێت کە ڕێژەی بادراو و ڕەنجێنراو بگات بە زمانی نووسین. بۆ نموونە. لە ڕێژەیەکدا وەك: (تۆ بی نێرە ئەوێ)، دەتوانین ئارایشتی بکەین و بی کەین بە (تۆ بینێرە|رە| ئەوێ). دەبا لە ئێرەدا بزانین چ کێشەیەك بەرپا دەبێت، ئەگەر ڕەگەزە ڕێزمانیەکان بخۆینەوە و شێوەزاری ناوچەیی بهێنینە نێو زمانی نووسینی ڕێزماندارەوە.

**٤:١- بەرئەنجام و لێکدانەوە:**

**لە هەموو ئەو پانۆرامایەدا، دەردەکەوێت کە دوو دەنگی خپ هەیە لە زمانەکەدا و بە ئەوەیش دەژێنەوە کە بە ڕاستەوخۆیی بخشێن لە نووکی (بزوێن). ئەو دوو دەنگەیش بریتین لە دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا و لە دەنگی /ر/ لە جێناوی کەسی دوەمی تاکدا (لە ڕێژەی فەرماندا). ئەمەیش چەند بەڵگەیەکە بۆ ڕەسەنایەتی بابەتەکە و بۆ هەبوونی دەنگی (خپ) لە ئەو دوو ڕەگەزەدا:**

- **لە زمانەکەدا ناوگرێک هەیە لە چەشنی /ی/ نەبزوێن، کە دەتوانێت دوو (بزوێن) لە یەکتری جودا بکاتەوە، وەك دەنگی /ی/ لە نێوان (هە) و مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، لە ڕێژەی (هەیە)دا. ئەدی بۆچی لە ئێرەدا ئەو دەنگانە /ت/ و /ر/ دەرکەوتن و دەنگی /ی/ دەرنەکەوت؟**
- **یان دەتوانین بڵێین: بۆچی دەنگی تر دەرنەکەوت، خۆ هەموو دەنگێکی (نەبزوێن) دەتوانێت ببێت بە (ناوگر)، یان ئەو ڕۆڵە بگێڕێت.**
- **یان، ئەگەر هەردوو ڕەگەزە ڕیزمانیەکە هەر بەیەك ڕوخسار ڕێنووس دەکرێن، وەك (ـە)، ئەدی بۆچی هەردوویان یەکسان نەبوون لە ئاستی ئەو دەنگەخپەدا؟ یان، بۆچی ناتوانین هەردوو دەنگەخپەکە /ت/ و /ر/ ئاڵوگۆڕ بکەین لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکە ڕێزمانیەکەدا.**
- **یان، بۆچی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ڕانەبردووی کاری (بوون)دا و لە ڕابردووی تەواودا هەر ئەو دەنگەی پاراستوە.**
- **یان، بۆچی لە جێناوی فەرمان (ـە)دا، هەر دەنگی /ر/ دۆزرایەوە، ئەگەرچی جێناوەکەیش ئاوێتە بووبێت و نەمابێت لە ڕیزی گوفتاردا. بۆ نموونە لە ڕێژەیەکدا وەك: (تۆبڵێ) و (تۆ بڕۆ)، هیچ ئاسەوارێکی ڕوخساری جێناوی فەرمان (ـە) نەماوە، کەچی (بزوێن)ێك دەتوانێت کلکی دەنگە خپەکە /ر/ بگرێت و بی خاتەوە سەرزار، وەك (تۆ بڵێ|ـر|ەوە) و (تۆ بڕۆ|ر|ەوە).**
- **باشە، لە ئەو دوو ڕەگەزە ڕێزمانیەدا، ئەگەر ئەو دوو دەنگە دەنگی خپ نین، ئایا پڕوپارچەی کام ڕەگەزی ڕێزمانین؟ یان لە کوێوە پەیدا بوون؟**

- یان لە ڕستەیەکدا وەك (تۆ بخەوەوە)، ئایا بۆچی زۆر پەسەندتر و ڕێزمانیترە ئەگەر بڵێیت (تۆ بخەوەرەوە)؟
- یان بۆچی ناتوانین دەنگی /ت/ بێبایەخ بکەین، یان بە دەنگێکی تر جێگیری بکەین لە ئەو جێیانەدا کە دەرکەوتوە؟
- ئەم بەڵگانە هەر هەمووی دەی سەلمێنن کە مۆرفیمی ئێستایی دەنگی خپی /ت/ هەڵ دەگرێت و جێناوی کەسی دوەمی فەرمان دەنگی خپی /ر/ هەڵ دەگرێت. ئەم دوو دەنگە بە زەقی و بە ئاشکرایی دەکەونە سەر زار و راوێشکەی دەکەن لە زمانی نووسیندا، بەبێ ئەوەی پەی بە میکانیزمەکەیان بردرابێت، یان هەر هیچ نەبێت سەرچاوەی پەیدابوونیان دیاری کرابێت. بەهیواین خزمەتێکی بچووك پێشکەش کرابێت بە ڕێزمانەکە و بە زمانە بێ خزمەتەکە.

وەك بەرەنجامێکی پێشکەوتوو، دەنگی خپ (Silent) ئەو دەنگەیە کە ڕۆژگار وندای کردوە و خپی کردوە لە جێگەی ڕەسەنی خۆیدا، بەلام زەبری بزوێن دەی دۆزێتەوە و دەی خاتە سەر زار، ئەگەر سەری بزوێنەکە بە ڕاستەوخۆیی بخشێت لە کلکی. لە ئەم هەلومەرجەدا، گۆ نە کردنی دەنگە خپەکە دەبێت بە (نارێزمان)، چونکە دەنگێکی ڕەسەنە، بەلام مێژوو خپی کردوە. بە ڕاستی، (تیۆری زەبری بزوێن) بەکارە و کاریگەرە، نەك لە ئاستی ئەم دوو نموونەی کە لە ئەم بابەتەدا باسکراون، بەڵکوو لە ئاستی هەر گرێیەکی جووتەدەنگدا کە زاری مرۆڤ بتوانێت بەرهەمی بهێنێت. بابەتی ئەم نووسینەیش، کە لە ساڵی (١٩٩٧)دا بڵاوکراوەتەوە، یەکەم نووسینی ئێمەیە کە زەبری بزوێنی بە وردی و بە سفتی کردبێت بە ئامێر بۆ ڕاستکردنەوەی فۆرمی فۆنەتیکی ئەو دوو ڕەگەزە ڕێزمانیە. واتە، کەڵکی بنەڕەتیمان وەرگرتوە لە بابەتی (دەنگی خپ)، لە یەکلاییکردنەوە و لە ساغکردنەوەی (تیۆری زەبری بزوێن)دا.

## سەرچاوەکان:

١- د. شێرکۆ بابان، ڕستەسازیو شیتەڵکاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦

٢- د. شێرکۆ بابان، دینامیزمی جێناوی لکاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧

٣- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤.

٦- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨١.

5. Nouveau Bescherelle, *Art de conjuger*, Dictionnaire de 12000 verbs, Hatier. Paris 1980.

# بابەتی دووەم

## چێوەی بڕگەی دەنگسازی[8]

### ١:٢- نموونەیەك لە شیتەڵکاریدا:

مەبەستی ئەم بەشە ئەوەیە کە چێوەیەکی ئەندازیارییانە بۆ بڕگە دابنێین و ئەو چێوەیە ببێت بە بنچینەیەك بۆ ڕۆنانی بڕگەی هەموو زمانەکە لە ڕیزی گوفتاردا. بە ئەم پێیە، ئەگەر وشەیەکی بەکارهێنراوی وەك (پۆ پەشمین) وەربگرین، دەبینین لە سێ بڕگەی دەنگسازی پێك هاتوە، وەك[9]:

پۆپەشمین: پۆ|پەشـ|ـمین:

ئەگەر ئەختێك بە وردی سەرنج بدەین لە بڕگەکان، دەزانین کە گرانترین نموونە (واتە درێژترین بڕگە) لە ڕیزی ئەو وشەیەدا لە سێ (فۆنیم) پێك هاتوە، وەك: (پەش : پـ/ـە/ش)، یان (مین: مـ/ـیـ/ـن). لە پاشتردا، ئەگەر بڕگەی (پۆ) وەربگرین و لە چێوەی ئەو دوو بڕگەی تری بدەین، دەبینین کە جێگەی فۆنیمی دوماهی بە (بۆش) دەمێنێتەوە، وەك: (پۆ: پـ/ـۆ/ـ). لەلایەکی ترەوە، لە ئەم سێ بڕگەیەدا چەند خاڵێك هەیە دەبێت تۆمار بکرێن، وەك:

<u>یەکەم</u>: بڕگەی (پۆ) هەرچەندە، هەر دوو خانەی پڕ کردووتەوە، بەڵام خانەکەی کۆتایی چوڵە و دەتوانرێت پڕ بکرێتەوە بە (نەبزوێن)ێك، وەك (پۆش، پۆپ، پۆت ... هتد).

---

[8] گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٦)، دهۆك ١٩٩٨، ل (٥٢-٦٢).

[9] لەبەر ئەوەی سادە و ساکارە، ئەم وشەیە بەکار هێنراوە و دەتوانین هەر وشەیەکی تر وەربگرین.

دووەم: ئەو دابەشکردنەی کە بە سێ (ترپەی بڕگەیی) دارێژراوە، هیچ پەیوەندییەکی نییە بە واتای وشەکەوە.

سێیەم: ئەو سێ بڕگەیە کاتێك کە بە ریز دەوەستن لە (نووسین)دا، یان لە (ئاخاوتن)دا، ئەوسا واتا دەبەخشن، وەك: (پۆ|پەشـ|ـمین).

بە بۆچوونی (ساڵی ٢٠١٣ و پاشتر)[10]، ئەگەر ئەو وشەیە بخەینە بەر لێکۆڵینەوەی چێوەسازییانە و لە نەخشەی (١:٢)دا بە شێوەیەکی زانستی دابەشی بکەین، دەتوانین چەند بنەمایەك دابڕێژین، وەك[11]:

بنەمای (١):

بڕگەی دەنگسازی لە دوو خانە پێکهاتوە، وەك: خانەی یەکەم (خانەی نەبزوێن)، بە هێمای (خ ن) و خانەی دووەم (خانەی بزوێن)، بە هێمای (خ ب).

بنەمای (٢):

لە بڕگەی دەنگسازی چێوە تەواودا، خانەی نەبزوێن (خ ن) و خانەی بزوێن (خ ب) هەموو کاتێك بارگەدارن، بە (نەبزوێن)ێك و بە (بزوێن)ێك. ئەو دوو دەنگە، بە ئەو ریزبەندەوە، پێکەوە دەبن بە دوو دەنگی سەرەکی و نەگۆڕ لە چێوەی بڕگەکەدا.

---

[10] بێگومان، بۆچوونەکانی ساڵی ١٩٩٨ و ساڵانی پاشتر گۆڕاون و بۆچوونە تازەکان لە ساڵی (٢٠١٣) بڵاو کراونەتەوە، لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (Vowel Power Theory). بۆ بەراوردکاری، ئەو کەسەی مەبەستی بێت، دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٦)، دهۆك ١٩٩٨.

[11] ئەو ریزە بنەمایەی کە ریزکراون، هەر بە سووك و ئاسان لەسەر وشەی (پۆپەشمین) دانراون، بەڵام بڕشتیان دەگات بە هەموو وشەیەکی تر لە زمانەکەدا.

**بنەمای (٣):**

**لە دامێنی خانەی بزوێن (خ ب)دا، گیرفانێك هەیە بە ناوی گیرفانی دامێن (گ د). ئەم گیرفانە دەتوانێت (پڕ) بێت یان (بۆش) بێت.**

**بنەمای (٤):**

**لە خانەی (بزوێن)دا، ئەگەر گیرفانی دامێن (پڕ) بێت، یان (یەك) نەبزوێن هەڵ دەگرێت (هەر نەبزوێنێك)، یان (دوو) نەبزوێنی پێكەوە گونجاو. ئەم جۆرە دەنگانە بە (نەبزوێنی پەراوێزی) ناوزەدكراون.**

**بنەمای (٥):**

**لە یەك بڕگەدا، تەنها هەر یەك (بزوێن) هەیە، بەڵام مەرج نییە هەر یەك (نەبزوێن) هەبێت.**

**بنەمای (٦):**

**لە یەك بڕگەدا ئەگەر هەر یەك (بزوێن) هەبێت، دەبێت ژمارەی (بڕگەكان) یەكسان بێت بە ژمارەی (بزوێنەكان).**

لە سیستمی بڕگەدا، بارگەی خانەی نەبزوێن (خ ن) و بارگەی گیرفانی دامێن (گ د) دەتوانن هەرچی (نەبزوێن)ێك بن. پاشان، ئەو بزوێنەی نێو خانەی بزوێن (خ ب) دەتوانێت هەرچی هەرچی (بزوێن)ێك بێت. كەواتە، دەشێت بڕگە هەبێت كە هەر دوو نەبزوێنەكەی نێو خانەی (خ ن) و (گ د) یەكسان بن، وەك: (نان، داد، شیش، لوول، ژاژ، كاك، مام، دید، سیس، كۆك، تات، شاش، كێك،....). سەبارەت بە هێماكاری، دەتوانین بڕگەكانی وشەی (پۆپەشمین) وەربگرین و چەند هێمایەك بەكاربهێنین بە ئەم چەشنە[١٢]:

[١٢] ئەم هێمایانە لە زۆربەی نووسینەكاندا دووبارە دەبنەوە، بەڵام ئێمە پیتی گەورە (كاپیتاڵ)، وەك (C. V. Q)، بۆ بارگەی بارگەی هەردوو خانەی سەرەكی (خ ب) و (خ ن) بەكار دەهێنین و پیتی بچووكیش (سمۆڵ)، وەك (c. c . o)، بۆ بارگەی هەردوو گیرفانە پەراوێزییەكە بەكار دەهێنین.

<u>یەکەم</u>: لە جێی هەر (نەبزوێن)ێکی سەرەکی دەتوانین پیتی گەورەی (C) دابنێین، بەرانبەر بە زاراوەی(Parent Consonant) . یان، لە جێی هەر (نەبزوێن)ێکی پەراوێزی پیتی بچووکی (c) دابنێین، بەرانبەر بە زاراوەی(Marginal consonant) .

<u>دووەم</u>: لە جێی هەر (بزوێن)ێکی سەرەکی دەتوانین پیتی گەورەی (V) دابنێین، بەرانبەر بە زاراوەی (Parent Vowel) .

سێیەم: لە جێی هەر خانەیەکی بۆش دەتوانین پیتی ( o ) وەربگرین بەرانبەر بە (سفر).

ئێستاش دەتوانین وشە ی(پۆپەشمین) بڕگەڕێژ و هێما ڕێژ بکەین بە ئەم شێوەیە:

پۆ|پەش|مین : CVo|CVc|CVc

کەواتە، دەنگەکانی /پ/، /پ/، /م/ هێمای (C) دەیان گرێتەوە و دەنگەکانی /ۆ/، /ـە/، /ی/ هێمای (V) دەیان گرێتەوە. هەروەها، هەردوو دەنگی /ش/ و /ن/ هێمای (c) دەیان گرێتەوە. پاشان، سەرنجێکی ورد لە ئەو سێ بڕگەیە پۆلێنکردنێك دەهێنێتەوە کایەوە. بۆ نموونە، بڕگەی |پۆ| ( CVo ) زۆر سووکە، چونکە گیرفانی دامێنی بۆشە، بەڵام هەردوو بڕگەی |پەش| و |مین| لە جۆری پڕن ( CVc )، چونکە گیرفانی دامێنیان بار کراوە بە بزوێنی پەراوێزی. ئەم جۆرە کێشەیە لە پاشتردا باس دەکرێتەوە. ئەم دابەشکردنە بە جوانی لە سەر نەخشەی (١:٢) پیشاندراوە.

| | کلك | | | نووك |
|---|---|---|---|---|
| | گ د | خ ب | خ ن | |
| CVo | _ | ـۆ | پـ | |
| CVc | شـ | ـە | پـ | |
| CVc | ـن | یـ | ـمـ | |

نەخشەی (١:٢): دابەشبوونی فۆنیمەکانی وشەی (پۆپەشمین)

## ٢:٢- ڕۆنانی بنیادی بڕگە:

بەپێی ئەوەی کە لە بنەماکانی پێشتردا گوتراوە و لە مێزەری نەخشەی (٢:١)دا نیگاری بۆ کێشراوە، بڕگەی دەنگسازی لە دوو خانەی سەرەکی و گیرفانێك پێك هاتوە. خانەی نەبزوێن (خ ن) هەموو کاتێك پڕە و هەر یەك (نەبزوێن) هەڵ دەگرێت و خانەی دوەمیش (خ ب) هەموو کاتێك پڕە و هەر یەك (بزوێن) هەڵ دەگرێت. ئەم دوو مەرجە وا دەکەن کە بتوانین بڵێین: لە کەمترین هەل و مەرجدا، بڕگەی دەنگسازی لە (نەبزوێن)ێك و لە (بزوێن)ێك پێك هاتوە. سەبارەت بە لێکخشانی دەنگەکان لە بنیاد ناوەوەی بڕگەدا، دەتوانین بڵێین: وەك بڕگە لە کورترین روخساردا لە (نەبزوێن)ێك و (بزوێن)ێك پێکهاتوە، دەبێت جۆرە (لکان)ێك هەبێت لە نێوان کلکی (نەبزوێن)ەکە و سەری (بزوێن)ەکەدا. واتە، دەبێت نەبزوێنەکە لە کلکەوە بلکێت و بزوێنەکەش لە نووکەوە. پاشان، وەك ئەو جۆرە لکانە زۆر پتەوە و زۆر سەختە، لێك ترازاندنی دەبێت بە هۆی خاپووربوونی چێوەی بڕگەکە، یان دەبێت بە هۆی لە ناوچوونی بەرهەمی کۆئەندامی ئاخاوتن کە بریتیە لە دەردووی گۆکراوی (گرێی جووتە دەنگ). کەواتە، ئەو لکانە پتەوە دەبێت بەهۆی دروستکردنی (دەردوو)ی ئاخاوتن و ئەو دەردوەیش کەمترین بەرهەمی گۆکراوە، کە کۆ ئەندامی ئاخاوتن بتوانێت بی بەخشێت بە ئاخێوەر. ئەم ڕاستییەیش دەشێت بکرێت بە بنەمایەکی تر:

بنەمای (٧):

**وەك بچووکترین دەردوو، کۆئەندامی ئاخاوتن دەتوانێت یەك بڕگەی پێکهاتوو لە یەك نەبزوێن و یەك بزوێن گۆ بکات بە ریزبەندی (نەبزوێن پاشان بزوێن).**

یان ئەگەر لکانی نێوان هەردوو دەنگەکەی ئەو جۆرە بڕگەیە هەرەس بهێنێت، ئەوا شتێك نامێنێتەوە کە لە یەکەی ئاخاوتن بچێت. واتە، دوو دەنگی تاك پەیدا دەبن،

کە زۆر ئەستەمە بە کۆ ئەندامی ئاخاوتن گۆ بکرێن. لەلایەکی ترەوە، جۆرە برگەی ئاوها کە چێوەی ( CVo ) هەڵ دەگرێت، دەتوانێت گیرفانی دامێن (گ د) پڕ بکاتەوە بە نەبزوێنێکی پەراوێزی. بۆ نموونە، برگەی (پۆ) دەتوانێت ببێت بە (پۆپ)، بەڵام ئەمەیان (لکان) نیە و بریتیە لە (پەنادان). واتە لە خانەی بزوێندا (خ ب) گیرفانی دامێن (گ د) پەنایەکە بۆ نەبزوێنێکی ( سەڵت و وێڵ). ئەو دیاردەی جووتبوونەیش زۆر کاتیە و هەر بزوێنێك پەیدا ببێت وەك (ـە)، ئەوا دەنگی (پ) گیرفانی دامێن (گ د) فەرامۆش دەکات و دەبێت بە هاوجووتی لە خانەی نەبزوێن (خ ن)دا، بەڵام لە برگەی بزوێنی دووەمدا (ـە)، وەك: (پۆ|پـە) بە هێمای (CVo|CVo). بە ئەم چەشنە، دەبینین کە دەنگی نەبزوێنی /پ/ کە پەنادرابوو لە برگەی |پۆپ|دا، بە زەبری بزوێنی /ـە/ لە جێیەکی خۆی دەترازێت و دەبێت بە نەبزوێنی سەرەکی بۆ برگەی داهاتوو (پە). واتە، دوو برگە لە چەشنی ( CVo) پەیدا دەبن. لە برگەی (پـە)دا، لە نێوان کلکی نەبزوێنی /پ/ و سەری بزوێنی /ـە/دا لکانی پتەو هەیە، چونکە ئەو دووجەمسەرە ئەکتیڤن بۆ یەکتر، بەڵام لە نێوان (کلکی بزوێن) و (سەری نەبزوێن)دا ئەو لکانە پتەوە دروست نابێت، چونکە ئەو دوو جەمسەرە سستن و ئەکتیڤ نین بۆ یەکتری.

## ٣:٢- بنیادی برگەی گران:

لە بەشەکانی پێشتردا، گوترا کە برگە لە دوو خانە و گیرفانێك پێکهاتوە و پاشان گوترا کە دوو جۆر برگە هەیە، وەك:

یەکەم: برگەی سووك CVo

دووەم: برگەی پڕ لە چەشن CVc

بە ئەم پێیە، دەبێت بڕگە بە (نەبزوێن) دەست پێ بکات بە گشتی و بە (بـزوێن) یان بە (نەبزوێن) کۆتایی بهێت. بەرانبەر بە ئەم بۆچوونە، هەنـدێك بڕگـە هەیـە کـە بـە دوو (نـەبزوێن) کۆتـایی دەهێـت. ئـەو دوو بزوێنـەش، لەبـەر ئـەوەی بـەبێ (بـزوێن) بـە یەکەوە دەنووسێن، نـاونراون (هێشووی جـووت نـەبزوێن)[13]. بـە راسـتی، بارگـەی گیرفـانی دامێن (گ د) دەتوانێت هـەر (نـەبزوێن)ێك بێـت بـە تـاکی، بـەڵام هـەر هێشـوویەکی (دوو نەبزوێن)، کە مـەرجی هێشـووی تێـدا بێـت، بـۆی هەیـە لـە ئـەو گیرفانـەدا ئـاکنجی بێـت. ئەمەیش چەند نموونەیەکە بۆ باسەکە: (ئاست، بەرز، گەنج، کورت، مێرد،...). ئەم جـۆرە بڕگە تازەیە بە هیمای بڕگەی گران (CVcc) پۆلێنکراون و لە نەخشەی (٢:٢)دا بـە سـفتی لە چێوەرێژ کراون. کەواتە، لە ئەم ئاستەیشدا، دەتوانین بنەمایەکی تر تۆمار بکەین:

بنەمای (٨):

**بڕگەی گران ئەو بڕگەیە کە لە گیرفانی دامێندا (گ د)، دوو دەنگی نەبزوێنی سەڵتی پێکەوە تەبا هەڵ دەگرێت، بە هێمای (CVcc).**

ئەمە و وەك لە گیرفانی دامێندا دوو نەبزوێن هەیە، دەنگی یەکەم ناتوانێت هـەر دەنگێـك بێـت و دەنگـی دووەمـیش ناتوانێـت هـەر دەنگێـك بێـت. واتـە چـەند دەنگێکـی دیـاریکراو هەیـە بـۆ نـەبزوێنی یەکـەم ، وەك: (ر، ن، س، ...) و چـەند دەنگێکـی دیـاری کراویش هەیە بۆ هێشوو بەستن بە هەر یەکێك لە ئەو دەنگانەوە. بۆ نموونە، دەنگی /ت/ دەنووسـێت بـە دەنگـی /س/وە و هێشـوو دروسـت دەکـات (ـست)، کەچـی دەنگـی /کـ/ نانووسێت پێیەوە و داوای بزوێنی بزرۆکە دەکات کە بلکێت بە کلکی /س/وە، وەك لە ئـەم بەراوردەدا دیارە:

[13] لە سەرچاوەی (٣)دا، خشتەیەکی بەرین ڕێکخراوە بۆ ئەم جۆرە هێشوانە.

ئاست: |ئـاسـت|: CVcc

ئاسك: |ئـا|سـك|: ( CVo: CVc )

لە ئێرەدا، چی گۆکردنی وشەی (ئاست) بە (دوو) بڕگە و چی گۆکردنی وشەی (ئاسك) و بە یەك بڕگە هەردووك دەبن بە هۆی بزڕکاندنی زمانەکە.

| | نووك (خ ن) | خ ب | کلك (گ د) | |
|---|---|---|---|---|
| ئاست | ئـ | ـا | ست | CVcc |
| بەرز | بـ | ـە | رز | |
| گەنج | گـ | ـە | نج | |
| کورت | کـ | ـو | رت | |
| مێرد | مـ | ـێ | ـرد | |

نەخشەی (٢:٢): دابەشبوونی فۆنیمەکانی بڕگەی گران لە ڕژێمی بڕگەدا

## ٢:٤- بنیادی بڕگەی لێکدراو:

لە ئەوەدا کە لە پێشەوە باسکرا، سێ جۆر لە بڕگەی ئاسایی دیاریکرا، وەك (سووك، پڕ، گران)، وەك لە سەر نەخشەی (٣:٢) ڕیز کراون:

| جۆری بڕگە | بڕگەی سووك | بڕگەی پڕ | بڕگەی گران |
|---|---|---|---|
| هێما | CVo | CVc | CVcc |
| نموونە | تا، با | تار، باس | سارد، ئاست |

نەخشەی (٣:٢): هەرسێ جۆرەکەی بڕگەی ئاسایی

بەرانبەر بە ئەم سێ جۆرە بڕگەیە، کە بە بڕگەی (ئاسایی) ناسراون، سێ بڕگەی (لێکدراو) هەن و ئەو سێ بڕگەیە لە دوو بڕگە پێکهاتوون، بە ئەم چەشنە:

یەکەم: لە نووکێ خانەی نەبزوێن (خ ن)دا، گیرفانێکی تر هەیە کە بە گیرفانی نووک (گ ن) ناوزەدکراوە و هێمای (.c)ی بۆ دانراوە. ئەم گیرفانە دەنگێکی (نەبزوێنی پەراوێزی) هەڵ دەگرێت لە چێوەی (نیمچە بڕگە)دا، وەك دەنگی بەرایی لە ئەم وشانەدا (پشوو، چزوو، چنار، سنوور، شکست، برنج).

دووەم: زاراوەی (نیمچەبڕگە) بە رانبەر بە بڕگەیەکی سووك (CVo) دەوەستێت، کە بزوێنەکەی بریتیبێت لە بزوێنی (بزرۆکە)، یان /i/.[14]

سێیەم: بڕگەی سەرەکی، کە بڕگەیەکی ئاساییە و لە ئەو سێ جۆرەیە کە لە سەر نەخشەی (٣:٢) دیاریکراون (CVo, CVc, CVcc). بۆ نموونە، ئەگە هێمای نیمچەبڕگە (.c) لە گیرفانی نووکی ئەو سێ بڕگەیە دابنێین، ئەوا دەتوانین سێ جۆر لە بڕگەی (لێکدراو) ریز بکەین، وەك لە سەر نەخشەی (٤:٢) پیشاندراون.

| جۆری بڕگە | بڕگەی سووکی لێکدراو | بڕگەی پڕی لێکدراو | بڕگەی گرانی لێکدراو |
|---|---|---|---|
| هێما | c.CVo | c.CVc | c.CVcc |
| نموونە | پشوو، چزوو | چنار، سنوور | شکست، برنج |

نەخشەی (٤:٢): نموونەی بڕگەی لێکدراو

[14] لە بڕگەی سووك (CVo) بترازێت، بڕگەی بزوێنی بزرۆکە دەبێت بە بڕگەی ساغ و تەواو لە جۆری بڕگەی پڕ و گراندا (CVo, CVcc).

**چوارەم**: لە بەراوردی ئەو دوو نەخشەیەی سەرەوەدا، دەر دەکەوێت کە بڕگەی (لێکدراو) پۆلێکی سەربەخۆ نیە، بەڵکوو دیوێکە، یان ژێرپۆلێکی لاوەکیە لە بڕگە ئاساییەکان.

ئەمە و لە کۆتایی ئەم کۆپلەیەدا دەتوانین بنەمایەکی تر دابڕێژین:

**بنەمای (٩):**

**لە بەر ئەوەی گیرفانی نووك هەیە لە خانەی نەبزوێندا و ئەو گیرفانە دەتوانێت نیمچەبڕگەیەك ئاکنجی بکات، بەرانبەر بە هەر بڕگەیەکی ئاسایی بڕگەیەکی (لێکدراو) هەیە.**

کەواتە، وەك سێ جۆر لە بڕگەی (ئاسایی) هەیە، سێ جۆریش لە بڕگەی (لێکدراو) هەیە. یان بەکۆی گشتی شەش جۆر لە بڕگەی گۆکراو هەیە بۆ لە قاڵبدانی زنجیرەی ئاخاوتن. لە نەخشەی (٥:٢)دا، گیرفانی نووك (گ ن) نیگار کراوە و نیمچەبڕگەکان لە ئەم گیرفانەدا خانەچن کراون.

| سەر | خ ن | | خ ب | | کلك |
|---|---|---|---|---|---|
| | گ ن | | | گ د | |
| پشوو | پ | ـشـ | ـوو | ـ | c.CVo |
| چنار | چ | ـنـ | ـا | ر | c.CVc |
| بنێشت | بـ | ـنـ | ـێـ | ـشت | c.CVcc |

نەخشەی (٥:٢): خانەپڕکرنی فۆنیمەکانی بڕگەی لێکدراو.

## ٥:٢- بنیادی بڕگەی ناتەواو[١٥]:

لە ئەو بابەتەدا کە لە پێشەوە باسکرا، سێ جۆر لە بڕگەی ئاسایی دیاریکرا، وەك : بڕگەی سووك (CVo) بڕگەی پڕ (CVc) بڕگەی گران (CVcc). پاشان، بەرانبەر بە ئەو سێ بڕگەیە، سێ جۆر لە بڕگەی لێکدراو دیاریکرا، وەك : بڕگەی سووك لێکدراو (c.CVo) بڕگەی پڕی لێکدراو (c.CVc) بڕگەی گرانی لێکدراو (c.CVcc).

سەبارەت بە بڕگەی (ناتەواو)، وەك چۆن بەرانبەر بە ئەو سێ جۆرە بڕگەئاساییە، سێ بڕگەی (لێکدراو) هەیە، سێ بڕگەی (ناتەواو)یش هەیە. لە بڕگەی ناتەواودا، خانەی نەبزوێن (خ ن) بۆشە و نەبزوێنی تێدا نیە. بە راستی، لابردنی یان گۆڕینی هەر دەنگێکی نەبزوێن لە گیرفانی دامێن (گ د) و لە گیرفانی نووك (گ د) نابێت بە عەیبداری لە بنیادی بڕگەکەدا، کەچی دەبێت بە هۆی گەمەیەکی دەنگسازیانە، بەڵام لابردنی دەنگی نەبزوێنی سەرەکی (C) لە خانەی نەبزوێندا (خ ن)دا دەبێت بە هۆی عەیبداری لە بنیادی بڕگەکەدا و پێناسەی بڕگەکە دەگۆڕێت بۆ (بڕگەی ناتەواو). لە ئەم جۆرە بڕگە ناتەواوەدا هێمای (Q) دەخرێتە جێی بۆشی نەبزوێن سەرەکی (C) و سێ جۆر لە بڕگەی (ناتەواو) دەردەکەوێت، وەك : بڕگەی سووکی ناتەواو (QVo) بڕگەی پڕی ناتەواو (QVc) بڕگەی گرانی ناتەواو (QVcc). بەرانبەر بەئەوەی گوترا، لابردنی دەنگی بزوێن سەرەکی (V) لە خانەی بزوێنی بڕگەدا (خ ب)دا نابێت بە هۆی عەیبداری لە بنیادی بڕگەکەدا و پێناسەی بڕگەکە ناگۆڕێت بۆ (بڕگەی ناتەواو)، بەڵام قەوارەی بڕگەکە خاپوور دەبێت و هیچ چشتێك نامێنێتەوە، کە پێی بڵێیت (بڕگەی زمان). لە سەر نەخشەی (٦:٢)، هەر سێ جۆرەکەی بڕگەی ناتەواو پێشاندراون. سەرنجێکی هورد لە ئەو سێ بڕگەیە دەری دەخات کە ئەم جۆرە بڕگەیە هەر لە ڕۆنانی ژێرەوەدا هەن. واتە،

---

[١٥] زاراوەی (ناتەواو) لە ئەو راستییەوە هاتوە کە هەلومەرجی بڕگەی تەواو و کەڵگداری تێدا نیە. واتە، نەبزێنە سەرەکیەکەی نێو خانەی (خ ن) ئامادە نیە لە خانەکەیدا، تا سەری بزوێنەکەی نێو خانەی (خ ب) بلکێت بە کلکیەوە.

کاتێك کە ئەم بڕگانە دەگەنە سەرلێو، ئەوا بە ناچاری چاك دەکرێنەوە و دەبن بە سێ بڕگەی ئاسایی. بەڕاشکاوی، پێ دەچێت کە بابەتی (بڕگەی ناتەواو) بریتیبێت لە چرایەکی دەستی وردبین لە شیتەڵکاری دەنگسازیدا، لە بەر ئەم هۆیانە:

یەکەم: پێ دەچێت کە چێوەی بڕگەی سووکی ناتەواو ڕەگیشەیەکی داچێنراوی دوورتری هەبێت لە بەهرەی زماندا. منداڵی ساوا کە زمان دەگرێت، ئەو بڕگە ناتەوانە چاك دەکاتەوە، بە بارکردنی نەبزوێنی سەرەکی، پاشان دەی نەخشێنێت بە نەبزوێنی پەراوێزی بۆ دروستکردنی سێ بڕگەی (ئاسایی) و لە پاشتردا، بۆ دروستکردنی سێ بڕگەی (لێکدراو) لە سەر بڕگەی (ئاسایی).

دووەم: لە بڕگەی سووکی ناتەواودا، تەنها هەر یەك (بزوێن) دەمێنێتەوە. کەواتە، دەشێت بنەمایەکی تر تۆمار بکەین، وەك:

بنەمای (١٠)؛

**هەر دەنگێکی (بزوێن) یەکسانە بە (بڕگە)یەك، بەڵام بڕگەکەی ناساغە و کلۆرە و لە پۆلێنکردندا هێمای بڕگەی سووکی ناتەواو (QVo) هەڵ دەگرێت.**

لە زگماکەوە و لە ڕەگێشەی سروشتیەوە، ئەم بزوێنە ئارەزوو و خولیایەکی زیرەکی تێدا هەیە بۆ لکان بە کلکی هاوکووفێکەوە کە بریتیە لە دەنگی (نەبزوێن)، بۆ دروستکردنی دەنگێکی سێیەم، کە بریتیە لە شابەرهەمی کۆئەندامی ئاخاوتن، کە لە ئیشەکانی ئێمەدا بە گرێی جووتەدەنگ (Duplex Sound Crystal) ناسراوە. واتە، هەموو منداڵێك دەتوانێت بڕگەی کلۆر گۆ بکات، بەڵام ئەو منداڵەی کە زمان دەگرێت، دەتوانێت کلۆریی بڕگەی ناتەواو چارەسەر بکات بە چاندنی دەنگێك، (کە فێربوونی پێویستە)، وەك نموونەی دەنگی /ب/ و دەنگی /د/، لە بڕگە کلۆرەکەی بزوێنی /ا/دا. لە ئەنجامدا، ئەو منداڵە زمانی دەپشکوێت بە بەرهەمهێنانی هەردوو بڕگەی تەواو (با) و (دا)، لە جیاتی

(باوە) و (دایە). بە شێوەیەکی تر، ئەو منداڵەی کە زمان دەگرێت، دەتوانێت دەنگی نەبزوێنی ئاسایی گۆ بکات بە نووکی بزوێنەوە، وەك گۆکردنی ئەو دوو نەبزوێنە بە نووکی بزوێنی /ا/وە. بێگومان، ئەم بنەمایە حیکمەتێکی زۆر زۆر بندووری تێدا هەیە و دەشێت ڕۆژێك لە ڕۆژان کەڵکی گەورە ببەخشێت بە دەنگسازی، چونکە هەر گرێیەك یان هەر یەکەیەك لە فۆرمی فۆنەتیکی زمانە سرشتییەکاندا بە ئەو بەهرەیە دروست بوە.

سێیەم: بە کۆی ئەو دوو خاڵەی سەرەوە، بڕگەی (ناتەواو) بەردی بناغەیە لە ئاخاوتندا و بڕگەی (ئاسایی) چینی یەکەمە لە سەر بناغەکە و بڕگەی (لێکدراو)یش چینی دوەمە لە سەر چینی یەکەم.

| جۆری بڕگە | بڕگەی سووکی ناتەواو | بڕگەی پڕی ناتەواو | بڕگەی گرانی ناتەواو |
| --- | --- | --- | --- |
| هێما | QVo | QVc | QVcc |
| نموونە | کەر\|کوو\|کی | نووسـ\|ـەر | نەی\|سووتـ\|ـاند |

نەخشەی (٦،٢)، خانەڕێژکرنی فۆنیمەکانی بڕگەی ناتەواو

لە بەراوردی ئەو نەخشانەی پێشەوەدا، دەر دەکەوێت کە بڕگەی (لێکدراو) و بڕگەی (ناتەواو) پۆلی سەربەخۆ نین، بەڵکوو دوو دیوی جیاوازن، یان دوو ژێرپۆلی لاوەکین لە بڕگە ئاساییەکان. ئەمە و لە کۆتایی ئەم کۆپلەیەدا دەتوانین بنەمایەکی تر دابڕێژین:

بنەمای (١١)؛

بەرانبەر بە هەر بڕگەیەکی ئاسایی، لە جەشنی سووك و پڕ و گران، بڕگەیەکی (ناتەواو) هەیە.

جۆرە بڕگەی ئاوها دەنگی نەبزوێن سەرەکی (C)، لە خانەی نەبزوێنی بڕگەدا (خ ن)دا، هەڵ ناگرێت. هەر لەبەر ئەوە، ناتوانێت بهێتە سەر زار، تا دەنگێکی نەبزوێن پەیدا نەکات و نەی خاتە جێی نەبزوێن سەرەکی (C) لە خانەی نەبزوێن (خ ن)دا و نەبێتەوە بە بڕگەی ئاسایی. کەواتە، وەك سێ جۆر لە بڕگەی (ئاسایی) هەیە، سێ جۆریش لە بڕگەی (لێکدراو) هەیە و سێ جۆریش لە بڕگەی (ناتەواو) هەیە. یان بەکۆی گشتی شەش جۆر لە بڕگەی گۆکراو (ئاسایی و لێکدراو) هەیە بۆ لە قاڵبدانی زنجیرەی ئاخاوتن و سێ جۆریش لە بڕگەی ناساغ (ناتەواو) هەیە، کە تیماریان پێویستە لە چرکەساتی بەرهەمهێنانی زنجیرەی ئاخاوتندا. لە رووی پۆلێنکردنەوە، دەتوانین ئەو نۆ (٣×٣=٩) جۆرە بڕگەیە خشتەڕێژ بکەین لە نەخشەی (٧:٢)دا[١٦]. لە ئەم پۆلێنکردنەدا، چەند بنەمایەکی زانستی هەیە و دەشێت تۆمار بکرێن:

یەکەم: لە سەر باری ئاسۆیی بڕگەکان پۆلێنکراون بۆ سێ جۆر (سووك، پڕ، گران) و لە سەر باری ستوونی بڕگەکان پۆلێنکراون بۆ سێ چین (ناتەواو، ئاسایی، لێکدراو).

دووەم: چینی (بڕگە ناتەواوەکان) کراون بە چینی یەکەم لە خشتەکەدا، چونکە بنەڕەتین و بڕگە ئاساییەکان لە سەر ئەوانە رۆنراون و پشتبەستن پێیان.

سێیەم: چینی (بڕگە ئاساییەکان) کراون بە چینی دووەم لە خشتەکەدا، چونکە بڕگە لێکدراوەکان لە سەر ئەوانە رۆنراون و پشتبەستن پێیان.

چوارەم: کەواتە، بڕگە لێکدراوەکان پشتبەستن بە بڕگە ئاساییەکان و بڕگە ئاساییەکانیش پشتبەستن بە بڕگە ناتەواوەکان. بە کۆی گشتی، بڕگە ناتەواوەکان بریتین لە (چینی بنەڕەت).

[١٦] ئەم خشتەیە لە ساڵی (٢٠١٣)دا هەموار کراوەتەوە.

**پێنجەم:** لە برگە ناتەواوەکانی چینی یەکەمدا (چینی بنەڕەت)، برگەی یەکەم هەر لە یەك (بزوێن) پێکهاتوە. کەواتە، هەر (بزوێن)ێك بریتیە لە نوخشانەی برگەیەکی ناتەواو، یان هەر بزوێنێك یەکسانە بە برگەیەکی ئامادە بۆ پێشوازی کردن لە (نەبزوێن)ێك.

**شەشەم:** لە ئەو نەخشەیەدا، ئەگەر سووچاوسووچ بڕۆین لە (سەرەوەی لای ڕاست) بۆ (ژێرەوەی لای چەپ)، ژمارەی (نەبزێنەکان) زیاد دەکات لە سفرەوە بۆ یەك، بۆ دوو، بۆ سێ و ئەمجا بۆ چوار. کەواتە، ساکارترین برگە لە یەك بزوێن پێکهاتوە و قورسترین برگە لە یەك بزوێن و چوار نەبزوێن.

**هەفتەم:** برگە ناتەواوەکانی چینی یەکەم (چینی بنەڕەت) گۆ ناکرێن بە زار، مەگەر بە ناتەواوی، یان چاك بکرێنەوە و بکرین بە ئەوانەی چینی دوەم (برگە ئاساییەکان).

| | پۆلێنکردنی ئاسۆیی | | | |
|---|---|---|---|---|
| | برگەی سووک | برگەی پڕ | برگەی گران | |
| برگەی ناتەواو | QVo | QVc | QVcc | پۆلێنکردنی ستوونی |
| برگەی ئاسایی | CVo | CVc | CVc | |
| برگەی لێکدراو | c.CVo | c.CVc | c.CVcc | |

نەخشەی (٧:٢): پۆلێنکردنی جۆرەکانی برگە

## ٦:٢ - بەرهەنجام و لێکدانەوە:

لە پانتای ئەم نووسینەدا، دەتوانین چەند خاڵێکی تایبەتی وەربگرین وەك بەرهەنجام و ئەمجا لە سەریان بکەوینە گفتوگۆ و لێکدانەوە:

- هەر چەندە باسەکە زۆر ساکارە و پێویست بە توێژینەوە و زانیاری زۆرتر دەکات، بەڵام مەبەستی ئێمە لە ئەوەدایە کە بڵێین: بڕگە بریتیە لە یەکەم دەردووی گۆکراو بە کۆئەندامی ئاخاوتن. واتە، لە بڕگە کەمتر گۆ ناکرێت، یان بە ئاسانی ناهێتەسەر زار. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە بڕگە بریتیە لە بەردی بناغەی گوفتار و لە بڕگە بترازێت هەموو دەنگێك دەکەوێتە دیوی فۆنەتیکەوە. بەرانبەر بە ئەم بۆچوونە، مامۆستای بەڕێز دکتۆر محەمەد مەعرووف فەتتاح دەڵێت: (بەڵگە نەویستە کە دەنگی زۆربەی فۆنیمەکانی زمان بە تەنها گۆ ناکرێت). ئێمە لە ئێرەدا بواری ئەم بۆچوونە گەورەتر دەکەینەوە و دەڵێین: (تاکە دەنگ، چی بزوێن و چی نەبزوێن، زۆر ئەستەم و دژوارە لە گۆکردندا، یان دەتوانین بڵێین: هەر گۆ ناکرێت). واتە، کورتترین بەرهەمی کۆئەندامی ئاخاوتن بریتیە لە بڕگەی جووتەدەنگ. واتە، ئەو گۆکراوەی کە بتوانێت سنووری لێوان ببەزێنێت و بگات بە دنیای گوفتار و ئاخاوتن. لە ئەم ڕووەوە، ئێمە بڕگەی سووکی ئاسایی (CVo) بە بنچینەترین دانەی گوفتار دا دەنێین، چونکە هەدوو گیرفانەکەی (گ د) و (گ ن) بەتاڵن و هیچ دەنگێکی پەراوێزی هەڵ ناگرن. ئەمەیش زۆر لە ڕێزماننووسان درکیان پێ کردوە و وەسفیان کردوە، بەس کەس وەك ئێمە نەی کردوە بە (بابەت) و نەی خستوەتە بەر شرۆکاری زانستی. ئێمە ئەو جۆرە بڕگەیەمان ناوزەد کردوە

بە کریستاڵی جووتەدەنگ[17] (Duplex Sound Crystal |C^V|) و ئەو تیۆرییەی کە ئەم بەرهەمە دروست دەکات، ناوزەدمان کردوە بە تیۆری زەبری بزوێن ( Vowel Power Theory) و لە ساڵی (٢٠١٣)دا لە کتێبێکدا بە زمانی ئنگلیزی بلاّومان کردوەتەوە.

- بە بۆچوونێکی پتەو، دەتوانین بڵێین: یەکەم نهێنی کۆ ئەندامی ئاخاوتن لە ئەوەدایە کە دەتوانێت کلکی (نەبزوێن)ێك بلکێنێت، بە شێوەیەکی پتەو، بەسەری (بزوێن)ێکەوە. لە نێرەدا، زمانەوانان دەڵێن: ئەو بزوێنە دەبێت بە ناوکی بڕگە و ئێمەیش دەڵێین: ڕاستە دەبن بە ناوکی گوفتار، بەلاّم هەر ئەم وەسف کردنە بەس نیە. هەر کەسێك کە ئیشەکانی ئێمە بخوێنێتەوە، تێ دەگات کە ئەوەی لە دەنگسازی سەرتاسەریدا تۆمار کراوە، بەس نیە. لە ئەم ڕووەوە، وردەکارییەکی پتەوی دکتۆر محەمەد مەعرووف فەتتاح[18] دەخەینە نێو چوارچێوە (کۆبوونەوەی بزوێن و نەبزوێن و دروستکردنی دانەیەك لە ئەنجامی ئەم کۆبوونەوەیەدا، یەکێکە لە ئەو بارانەی کە قسەکردن هێناویەتیە کایەوە و دەبێت دانی پێدا بنرێت). بە ڕاستی ئەم داناییەی مامۆستا لە ئەو بەرەنجامە دەچێت کە لە سەرەتای ئەم خاڵەدا دیاریمان کردوە، بەلاّم کۆبوونەوەی بزوێن و نەبزوێن بە شێوەیەکی هەڕەمەکی نیە و بە زەبری بزوێن (سەری بزوێن) لە (کلکی نەبزوێن) جووت دەبێت. لە ئەو جووتبوونەدا لکانێکی پتەو پەیدا دەبێت و ئەو لکانە دەنگێکی سێیەم (کریستاڵی جووتەدەنگ) دەهێنێتە کایەوە، کە نوخشەی (دەستپێکی ئاخاوتن) هەڵدەگرێت.

---

[17] لە پێشتردا، ناوزەدمان کردبوو بە گرێی دەنگسازی، واتە (Phonemic Junction).

[18] سەرچاوەی (٢).

- بە بۆچوونی ئێمە، لە رۆنانی ژێرەوەدا، واتە لە ناخی بیردا، بڕگە چێوەیەکی دوو خانەی پتەوی هەیە (خ ن) و (خ ب) و هەر یەکێك لە ئەو دوو خانەیە گیرفانێکی تێدایە (گ ن) و (گ د). لە ئەو چێوەیەدا، بزوێنێك لە خانەی (خ ب)دا دەبێت بە ناوکی بڕگەکە و لە دەوری ئەو ناوکەی کە دەبێت بە (تەوەر)، چالاکی دەنگسازی دەست پێ دەکات. لە نێوان هەردوو خانەی (خ ن) و (خ ب) دا لکانێکی پتەو پەیدا دەبێت و گیرفانی دامێنیش (گ د) دەتوانێت (نەبزوێن)ێك هەڵ بگرێت، بەڵام بە (پێوەلکان) نا، بەس بە شێوەیەکی کاتی. لە بڕگەی گراندا، بەپێی هەلومەرجێکی ورد و تایبەتی، گیرفانی دامێن (گ د) دەتوانێت دوو نەبزوێنی (پێکەوەتەبا) هەڵ بگرێت.
- لە رووی دابەشکردنەوە، دەتوانین بڕگە دابەش بکەین بەسەر دوو خێزاندا، وەك:

<u>یەکەم</u>: ئەو بڕگانەی کە هەلومەرجی گۆکردن هەڵ دەگرن، وەك بڕگە ئاساییەکان (CVo, CVc, CVcc) و بڕگە لێکدراوەکان (c.CVo, c.CVc, c.CVcc).

<u>دووەم</u>: ئەو بڕگانەی کە ناساغ و ناتەواون و هەلومەرجی گۆکردن هەڵ ناگرن، کە تەنها لە ناخی بیردا هەن و کاتێك کە لە لێو دەرژێنەخوارەوە، دەبێت پسوولەی بڕگە ئاساییەکان (CVo, CVc, CVcc) هەڵ بگرن. ئەم خێزانە بڕگەیە هەندێك لە رەگەزە رێزمانیەکان دەگرێتەوە، لە چەشنی بڕگە ناتەواوەکان (QVo, QVc, QVcc).

- لە رووی رۆنانەوە، ئێمە دەتوانین بڵێین: بەرانبەر بە هەر سێ بڕگە ئاساییەکە (CVo, CVc, CVcc) سێ بڕگەی لێکدراو (c.CVo, c.CVc, c.CVcc) و سێ بڕگەی ناتەواو (QVo, QVc, QVcc) هەن. لە ئەم رووەوە، مامۆستا رەحمان ئیسماعیل[19] کاری چەند زمانێکیی لە یەك خشتەدا کۆ کردوەتەوە و بە جوانی بەراوردی

[19] سەرچاوەی (٣).

کردوون. لە ئەو وردەکارییەدا، زۆر بابەتی جوان دەرخراوە، بەلآم رەنگە ئەو پۆلێنکردنەی ئێمە دابەشکردنێکی نوێ ببەخشێت بە بابەتەکە. بە بۆچوونێکی سەرپێیی، ئێمە پۆلینکرنەکەی مامۆستای پایەبەرز تۆفیق وەهبی و مامۆستا نووری عەلی ئەمین بە شیاوتر دەزانین، چونکە لە سەر بنەمای سێ برگە ئاساییەکە دانراوە. واتە روخسارە بنجیەکانیان دیاریکردوە.

- هەندێك لە زمانەوانان دەنگی /ئـ/ یان بە (بزوێن) ژماردوە لە وشەکانی (ئا، ئاو، ئارد، ئاش، ئەرك،...)، یان بە هیچیان نە ژماردوە. بەس ئێمە دەڵێین: لە دەستپێکی ئەو وشانەدا، دەنگێکی (نەبزوێن) هەیە لە چەشنی دەنگی /ئـ/، یان لە چەشنی دالی کلۆر لە زاری سلێمانیدا، یان لە چەشنی دەنگی /h/ لە زمانی فەرەنسیدا. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین کە ئەم بۆچوونە هەڵ دەوەشێتەوە لە زمانەوانیدا، چونکە هەبوونی قەوارەی ئەو دەنگە زۆر ئاشکرایە و لە گەڵ ئەو بنەمایەدا چەسپە کە دەڵێت: **ناوکی برگە بزوێنە و برگەیش بە (نەبزوێن) دەست پێ دەکات**[20]. لە راستیدا، زۆر نائاساییە کە بڵێین: وشەی (ئاو) بە بزوێنی /ا/ دەست پێ دەکات، یان بڵێین: دەنگی /ئـ/ بزوێنە، چونکە برگەی گۆکراو و سەنگین بە (نەبزوێن) دەست پێ دەکات.
- لەلایەکی ترەوە، زمانەوانان بۆ ئەوە دەچن کە برگەی لێکدراو هەیە و نیمچە برگەیش هەیە، بەلآم نای کەن بە بابەت و چێوە رێژیان ناکەن. پاشان، پەنا نابەن بۆ باری چێوەسازی برگە لە ناخی بیردا و برگەی ناتەواو ناکەن بە بابەت. واتە، زوومی توێژینەوە ناخەنە سەر ئەو وردەکارییەی کە نێوان رۆنانی ژێرەوە (input) و رۆنانی سەرەوە (output)ی برگەدا هەیە. لە ئەم رووەوە، ئێمە لە ئەو باوەڕەداین،

---

[20] بەداخەوە، ئەو دوو سەرچاوەیە لەبەردەستدا نەبوون لە کاتی نووسینەوەی ئەم توێژینەوەیەدا. واتە، پشت بەستراوە بە ئەو زانیارییانەی کە لە سەرچاوەی (٢)دا تۆمارکراون.

ئەگەر بڕگەی ناتەواو نەبا لە ناخی بیردا، ئەوا بە هیچ جۆرێك داڕێژتنەوەی چێوەی بڕگە (Resyllabification Processes) پێویست نە دەبوو لە ریزی رستەی گۆکراودا.

- بزوێنی بزرۆکە بریتیە لە دەنگێکی ڕەسەن و هەردەم (لەسەرپێ) بۆ فریاکەوتن، بەلاّم بەبێ (پیت) نابووت بوە لە رێنووسدا. لە گەڵ ئەوەیشدا، ئەم بزوێنە هەر نیمچە بڕگەی سووك (CVo) دروست ناکات، چونکە دەتوانێت بڕگەی پڕ سەربەخۆی (CVc) دروست بکات وەك (دز، کز، فت، مت، گڕ، پڕ،...)، یان دەتوانێت بڕگەی گرانی سەربەخۆی (CVcc) دروست بکات، وەك (پشت، بست، کفت، درز، کرژ، گرژ، ترش، ...). ئەم جۆرە بڕگانە نموونەیان زۆرە لە زمانەکەدا.
- بە پێی ئەو زانیارییانەی کە لە ئەم نووسینەدا باسکران، دەبێت ژمارەی بڕگە لە هەر دەقێکدا یەکسان بێت بە ژمارەی بزوێنەسەرەکیەکان، یان بە ژمارەی ئەو لکانانەی کە لە نێوان سەری بزوێن و کلکی نەبزوێدا هەیە.

دکتۆر محەمەد مەعرووف فەتتاح دەڵێت: لە زمانەوانیدا، بە گشتی بڕگە مافی خۆی وەرنەگرتوە، بەلاّم زمانەوانی ناتوانێت واز لە بڕگە بهێنێت. ئێمەیش دەنگمان دەخەینە پاڵ دەنگی مامۆستا و ئەوەی لە ئەم نووسینەدا باسکراوە (هەروەها لە دەیان کتێب و نووسیندا) بریتیە لە بەڵگەیەکی زانستی بۆ داکۆکیکردن لە رۆڵی بڕگە لە دەنگسازییدا. لە کۆتاییدا، بە هیوایین کە چشتێکی نوێ خرابێتە سەر ریزمانی بڕگە[21].

[21] ئەو بیروبۆچوونانەی کە لە ئەم نووسینەدا تۆمارکراون، لە ماوەی (١٧) ساڵی رابردوودا، لە (١١) کتێبی توێژینەوەدا و لە دەیان نووسیندا بلاّوکراونەتەوە. تا ئێستا سێ پرۆفسۆری ناودار و خاوەن کتێب لە سەر ئاستی جیهان ئەو ئیشانەیان بە (ئەرێنی) هەڵ سەنگاندوە.

## ٧:٢ - بەرەنجامی پێشکەوتوو:

جاران، پێش ساڵی (٢٠١٣)، دەمان گوت: بنیادی چێوەی بڕگە لە سێ خانە پێکهاتوە (بەرایی، ناوەند، دوماهی)، بەڵام ئێستا دەڵێین: بنیادی بڕگە لە دوو خانە پێکهاتوە، خانەی نەبزوێن (خ ن) و خانەی بزوێن (خ ب) و هەر خانەیەك گیرفانێکی هەیە لە پەراوێزدا، گیرفانی نووك (گ ن) لە (خ ن)دا و گیرفانی دامێن (گ د) لە (خ ب)دا. بە راستی، کرۆکی زانستی بابەتەکە نەگۆڕاوە، بەس دابەشکردنی جێگەکان هەموار کراوەتەوە و خانەی دوماهی کراوە بە گیرفانی دامێن (گ د) و خانەی بەرایش گیرفانی نووك (گ ن)ی بۆ زیاد کراوە، چونکە دەتوانێت دوو دەنگی (نەبزوێن) هەڵ بگرێت. لە ساڵی (٢٠١٣)دا، لە نەخشەی (٧:٢)دا، چینی (بڕگەی ناتەواو) کراوە بە چینی یەکەم (چینی بنەڕەت)، لە جیاتی (بڕگە ئاسایی)، چونکە بنیادی بڕگە ئاساییەکان لە بزوێنەوە سەرچاوە دەگرێت. سەرەڕای ئەوە، پۆلینکردنی ئاسۆیی و ستوونی بە هوردی روونکراونەتەوە و لە خشتەکەدا پەیڕەوکراون. ئەمانە هەر هەمووی بۆ ئەوەیە کە خوێنەر و توێژەری ئازیز بە شێوازێکی ئاسانتر و رەوانتر بە بابەتەکە ئاشنا بکەین. بێگومان، ماکەکانی ئەم هەموارکردنەوەیە رەنگی داوەتەوە و کاری داوەتەوە لە گشت ئەو کتێبانەدا کە لە ساڵی (٢٠١٣)وە بڵاوکراونەتەوە.

سەرچاوەکان:

١. د. شێرکۆ بابان، چەند نووسینێکی بڵاونەکراوە لە بواری دەنگسازیدا.

٢. د. محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی ، زانکۆ سەلاحەدین، هەولێر .١٩٨٧

٣. رەحمان ئیسماعیل حەسەن، بڕگە و ئاسان بوونی بڕگە لە کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر .١٩٩١

٤. تالیب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆجی کوردی و دیاردەی ئاسان بوونی فۆنیمەکان لە زاری سلێمانیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر .١٩٨٩

٥. د. وریا عومەر ئەمین، شەپۆلەکانی شیعری کوردی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ١٢٦، ساڵی ١٩٩٠.

٦. د. عبدالرحمن لیوب، الکلام انتاجه و تحلیله، جامعه الکویت .١٩٨٤

٧. شاکر فەتاح، گیروگرفتەکانی رێنووس کوردی و شێوەی چارەکردنیان، گۆڤاری دەستەی کورد لە کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی (٩)، ساڵی ١٩٨٢.

# بابەتی سێیەم

## ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە[22]

لە ڕامالینی زمانەکەدا بە میکرۆسکۆپی لێکۆڵینەوە، زوومی رووماڵ دەگات بە چەندین دیاردەی سەیر و بەچەند میکانیزمێکی پتەو. ئەم دیاردانەیش، هەر هەموویان بەشداری دەکەن لە بە گەڕخستنی مەکینە سنتاکسیەکەدا. لەئەم ڕووەوە، (زەبری بزوێن)[23] دەورێکی باڵای هەیە. بێگومان، مەبەست لە ئەو زەبرە ئەو خۆشەویستیەیە کە لە دەنگی (بزوێن)دا هەیە بۆ چاوی کاڵی دەنگی (نەبزوێن). ئەم خۆشەویستیەیش وا دەکات کە کۆئەندامی ئاخاوتن بتوانێت ترپەی (جووتەدەنگ) دروست بکات لە نێوان ئەو دوو تەرزە دەنگەدا و ئەو ترپەیەش دەتوانێت ببێت بە نێرکی بڕگەی دەنگسازی. بە ئەم شێومیە، لەزۆر جێدا ئێمە کەڵکمان لە (زەبری بزوێن) وەرگرتوە و بەکارمان بردوە بۆ دۆزینەوەی دەنگی نادیار و بۆ ئارایشت کردنەوەی ڕەگەزە ڕێزمانیەکان. پاشان، کەڵك وەرگیراوە لە میکانیزمی جێگۆڕکێی جێناو بۆ جوداکردنەوەی دەنگەکان و بۆ روون کردنەوەی گۆشە تاریکەکانی ڕستە. بە ئەم چەشنە، ئێمە توانیومانە چەندین بنەما و چەندین میکانیزم تۆمار بکەین و بیان کەین بە (پێوەر) لە نێوان خۆیاندا. ئەمەیش لەپێناوی ئەو مەبەستەدا کە زمانەکە هەر خۆی خۆی ڕاست بکاتەوە و هەر خۆی بی سەلمێنێت کە ئەوەی کراوە، پتەوە بە ئەو ڕادەیەی کە هەڵە پەسند ناکات. لە ئەم ڕووەوە، چەند خاڵێکمان هەڵ بژاردوە کە دەتوانن ئێوەی ئازیز تێ بگەیێنن، چونکە پێویست بە ئاڵۆزکردن ناکات و ڕێزمانەکە هەر خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە.

---

[22] گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٩)، ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە (٥٩-٦٨).

[23] زاراوەی (زەبری بزوێن) بە واتای (Vowel Power) هاتوە.

## ١:٣- ڕوخساری جێناو:

لە ئاستی جێناودا دەتوانین چەند نموونەیەکی بەرچاوی وەربگرین، وەك:

یەکەم: جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ێت)[٢٤] لە ئەم جێناوەدا ئەم کێشانە هەن:

- هەندێك لە ڕێزمانووسان داکۆشان لەسەر ئەوە دەکەن کە ڕوخساری ڕەسەنی ئەم جێناوە بریتی بێت لە (ێ)، وەك: (شیلان دەکەوێ)[٢٥].
- هەندێکی تر ڕوخساری ئەم جێناوە بە (ێت) دەناسن و هەر بە ئەو ڕوخسارەیش ڕێنووسی دەکەن، وەك: (شیلان دەکەو(ێت)[٢٦]
- لە هەندێك ناوچەدا، ڕوخساری ئەم جێناوە بە (ێتن) گۆ دەکەن، وەك: (دەکەوێتن)[٢٧]

بەرانبەر بە ئەوسێ خاڵە، چی ڕێزماننووس، چی ڕۆژنامەنووس، چی نووسەر، چی ئاخێوەر، ئەو جێناوە بە ڕوخساری ڕەسەنی (ێت) ڕێنووس دەکەن، ئەگەر نووکی دەنگێکی (بزوێن) بەراستەوخۆیی بخشێت لە کلکی جێناوەکە، وەك:

شیلان دەکەو(ێت)ـەوە

شیلان دەکەو(ێت)ـە سەر زەوی

---

[٢٤] ئێمە کردوومانە بە کەلتوور و لە هەموو نووسینەکاندا و لەهەموو جێیەکدا ئەم جێناوە بە ڕوخساری تەواوی (ێت) ڕێنووس دەکەین. ئەم ڕوخسارە لاروخسارێکی تری هەیە لە چەشنی (ات)، کە لەبەرەنجامی پێنجەمدا، لە کۆتایی ئەم نووسینەدا باسی دەکەین.

[٢٥] بە داخەوە هەندێك لە نووسەران ڕوخساری /ێ/ و /ا/ تۆمار دەکەن بۆ جێناوی (ێت) و بۆ ئەلەمۆرق (ات).

[٢٦] ئەو نووسەرە بەرێزانەی کە ڕوخساری (ێت) بەکار دەهێنن زۆر زۆرترن بەرادەی ئەوانە کە (ێ) بەکار دەهێنن. ئەو نووسەرانە نازانن کە (ێ)ی ڕوودان هەیە وەك (دەسووتێم). ئەو (ێ)یە تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ڕوخساری (ێ) و ئەوسا ئاسەواری جێناوەکە ون دەبێت. بۆ نموونە، وەك [دەسووت (ێ) (.)] لە جیاتی [دەسووت (ێ) (ێت)]. ئەمەیش وا لە هەندێك نووسەر دەکات کە بەناهەق بڵێت: جێناوەکە نادیارە لە ڕووبەری ڕانەبڕدوودا. بەرانبەر بە ئەمە، لە نموونەیەکدا وەك [دەخەو (ێت)ەوە] هەردوو دەنگی جێناوەکە دیارن. یەکەمیان /ێ/ ئاوێتە نەبوە چونکە (ێ)ی دەمکاتی ڕانەبڕدوو لە ئێرەدا نیە و دوەمیان /ت/ بە زەبری بزوێنی /ە/ لە گۆ نەکردن ڕزگار بوە.

[٢٧] ڕوخساری (ێتن) زۆر بە دەگمەن دەگات بەزمانی نووسین، مەگەر لەدەقێکدا کە بەزمانی ناوچەیی دیاری کرابێت.

بەکورتی، لە خاڵی یەکەمدا، سەری بزوێنی /ـە/ دەخشێت لە کلکی دەنگی خپکراوی /ت/ و دەی هێنێتەوە بۆ نێو ڕیزەکە و دەی کات بە نموونەکەی خاڵی دوەم. لە گەڵ ئەوەیشدا خاڵی دوەم بەبێ ئەو بزوێنەش دەتوانێت روخساری (ێت) دەربخات بەبێ ئەوەی لاسارێتی ڕێزمانی ئەنجام درابێت. لە خاڵی سێیەمدا، دوو دەنگی دەرەکی کراون بە سەربار. یەکەم دەنگ بریتیە لە دەنگی بێ ڕێنووس (بزرۆکە)[٢٨] و دوەم دەنگ بریتیە لە نەبزوێنی /ن/. هەر لەبەر ئەوە، روخساری جێناوەکە بوە بە (ێتن). بە بۆچوونی ئێمە، ئەم کردەوەیە بۆ پاراستنی دەنگی /ت/ پەیدا بوە لە زمانەکەدا. ئەگەرنا، بۆچی ئەو دەنگە سەربارانە لەناودەچن کاتێك کە بزوێنێك هەبێت بۆ پاراستنی دەنگی /ت/. بۆ نموونە، ئەگەر ڕەگەزی (ەوە) سەربارکرا، ئەوا ناگوترێت: (شیلان دەکەوێتنەوە*)، بەس دەگوترێت: (شیلان دەکەوێتەوە). لەئەم روانگەیەوە، روخساری (ێت) خۆی خۆی دەسەپێنێت لە زمانی نووسیندا و هەر هەموویان یەك دەخات لە ئەو کاروانە پیرۆزەدا. کەواتە، ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە و هەر خۆی روخساری ناتەواوی (ێ) دەکات بە روخساری تەواوی (ێت) و هەر خۆیشی روخساری بارکراوی (ێتن) فارس دەکاتەوەو دەی کاتەوە بە (ێت). کەواتە، هەر روخساری (ێت) شایستەی ئەوەیە کە بکرێت بە دیاری بۆ زمانی نووسین، وەك زۆربەی نووسەران پیادەی دەکەن و لەگەڵ ئەوەیشدا، هەندێك لە نووسەران روخساری (ێ) بەکاردەهێنن بەشێوەیەکی بەربلاو. یان هەندێك لە زمانەوانان بە ناوی پێشکەوتنی زمانەوە زمانەکە پەرپووت دەکەن و بەزمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە دەنووسن و هیچ خۆیان هیلاك ناکەن لە گەمە ڕێزمانیەکەدا.

[٢٨] ئەم بزوێنیە بێ ڕێنووسە و زۆر جار وا هەست دەکرێت کە (بزوێن) لە ئارادا نیە، کەچی هەیە. بۆ نموونە، روخساری (ێتن) لە دوو برگە پێکهاتوە، وەك: (یێـ|ـتن)؛ یان بە هێمای (QVo.CVc) برگەی یەکەم ناتەواوە و برگەی دوەم تەواوە و لە جۆری پڕە. ئەم میکانیزمەیش داکۆشان دەکات لەسەر هەبوونی /ت/ لە ڕیزەکەدا. هەر لەبەر ئەوە، برگەیەکی تەواوی بۆ دابین کراوە. بۆ زانیاری زیاتر، لە سەر برگەسازی، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ لیستی کتێب و نووسینەکان لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا. بابەتی برگەسازی لە دەنگسازیدا لە نووسینێکەوە دەست پێدەکات، کە لە ژمارە (١٩٩٨/٧٦)ی گۆڤاری (مەتین)دا بڵاوکراوەتەوە، لەژێر ناوی (چێوەی برگەی دەنگسازی/ بەشی دوەم لە ئەم کتێبەی بەردەست).

دووەم: جێناوی کەسی دووەمی تاک (یت)، لە ئاستی ئەم جێناوەیشدا دوو هەڵوێستی هەیە:

- هەندێك لە ڕێزمانووسان داکۆشان لەسەر ئەوە دەکەن کە ڕوخساری ڕەسەنی ئەم جێناوە بریتی بێت لە (ی)، وەك: (تۆ دەکەوی)
- هەندێکی تر ڕوخساری ئەم جێناوە بە (یت) دەناسن و هەر بە ئەو ڕوخسارەیش ڕێنووسی دەکەن لە گشت جێیەکدا، وەك: (تۆ دەکەویت).

لەئاستی ئەم کێشەیەدا، هیچ لاسارییەکی ڕێزمانی ناچەسپێت ئەگە جێناوەکە کرا بە (یت) و لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە هەر هەمووومان یەك دەگرین، ئەگەر بزوێنێك بخشێت لە کلکی جێناوەکە، وەك: (تۆ دەکەویتەوە). لە ئێرەیشدا زۆر زۆر ئاشکرایە، کە زمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوەو هەر خۆی هاوار دەکات کە ڕوخسار (یت) ڕەسەنە و یەکخەری زمانەکەیە. ئەمە و وەك حەشارگەیەکی ڕێزمانی، لە کاری تێنەپەڕی یائیدا، وەك (پژمین، کۆکین، ...)، ناتوانین بڵێین (تۆ پژمی، تۆ کۆکی، ...) و بە ناچاری دەبێت بڵێین (تۆ پژمیت، تۆ کۆکیت، ...).

### ٢،٣- ئاسینەوەی دەنگی (خپ):

بەرانبەر بە ئەم کێشەیە، ئێمە لە ژمارەی (١١٦)ی گۆڤاری کاروانـدا، وتارێکمان بلاّو کردووەتەوە لەژێر ناونیشانی (دەنگی خپ لە زمانی کوردیدا)[٢٩]. لە ئەوێدا، سەلمێنراوە کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ڕەسەندا بریتیە لە (ـەت) و جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە) بریتیە لە (ـەر). واتە، یەکەمیان دەنگی خپی /ت/ هەڵ دەگرێت و دووەمیان دەنگی خپی (ر) هەڵ دەگرێت. ئەم دوو دەنگە خپە زۆر لەمێژە ون بوون و تەنها هەر لە ژینگەی

[٢٩] ئەم بابەتە کراوە بە (بابەتی یەکەم) لە ئەم کتێبەدا، لە ئەو نووسینەدا بەوردی و بەجوانی ئەو دوو دەنگە خپە خراونەتە نێو چوارچێوە.

تایبەتیدا زیندوو دەبنەوە. لە کۆپلەی پێشوودا، ئەوە دەرخراوە کە بزوێنێك دەتوانێت دەنگی /ت/ رابکێشێت و روخساری رەسەنی هەردوو جێناوی (ێت) و (یت) دیاری بکات بە ئارایشتی تەواوەوە. لەئەم جێناوانەدا گۆ نەکردنی دەنگی /ت/ کاتیە و دەتوانرێت لە هەموو جێیەك رێنووس بکرێت و بخرێتە بەر گۆ کردن. بۆ نموونە، ئەگەر لە جێی (ئەو دەکەوێ) نووسرا (ئەو دەکەوێت) ئەوا هیچ ناقەومێت و زۆربەی نووسەران پیادەی دەکەن. کەواتە، ئەو کەسانە لاسارییەك ڕاست دەکەنەوە. لە ئەم ئاستەدا، دەتوانین دوو نموونە وەربگرین، وەك: (ئەو کەوتوە : تۆ بکەوە). ئێستا، ئەگەر هەردوو بزوێنەکەی کۆتایی بخشێنین لە بزوێنێك بە راستەوخۆیی، ئەوا دەبینین کە هەردوو مۆرفیمەکە بە ئەم چەشنە روخسار دەگۆڕن: (ئەو کەوتوەتەوە : تۆ بکەوەرەوە). کەچی، لە ئەوێدا، ئەگەر پاشگری دووپاتی (ەوە) لابردرا، ناتوانین بڵێین: (ئەو کەوتوەت* :تۆ بکەوەر*). کەواتە، زمانەکە خۆی خۆی راست دەکاتەوە و دەڵێت: ئێوەیش خاوەنی دوو دەنگی خپن و ئیتر ئەو گەرەلاوژەیە و لاسارییە رێزمانیە لاببەن و رووبکەن لە دەنگی خپ (silent)، کە رۆژگار ونی کردوە، بەلام ژێرەمۆی رێزمانی کوردی ونی نەکردوە و بە (زەبری بزوێن) وەك ماستی سپی دەری خستوە بە لالێوی هەمووماندوە.

### ٣،٣- بەرگری لە هەبوونی جێناوێك:

هەندێك لە رێزمانووسان، وەك خوالێخۆشبوان (مەسعوود محەمەد و ئەوڕەحمانی حاجی مارف)، وا بۆی دەچن کە جێناوی کەسی سێیەمی تاك (نادیار) بێت لە رووبەری زمانەکەدا. سەبارەت بە بیروبۆچوونی ئێمە، ئێمە لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا نین، چونکە ئەو جێناوە بە روخساری رەسەنی خۆی (ێت) لە رووبەری رانە بردووی زمانەکەدا هەیە و دیارەو بەرجەستەیە، بەئەم چەشنە:

**یەکەم:** لە رووبەری رانەبردوودی ئاساییدا، واتە لە رانەبردووی هەموو کاری زمانەکەدا بێجگە لە (بوون و هەبوون)، جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ێت) هەیە و دیارە.

**دوەم:** لە رووبەری رانەبردووی تەواودا، واتە لە رانەبردووی کاری (بوون) و دارشتەکەی (هەبوون)دا، ئەو جێناوە دەبێت بە (نادیار).

**سێیەم:** لە رووبەری رابردوودا و لە هەموو کاری زمانەکەدا، بەبێ جوداکاری، ئەو جێناوە نادیارە.

بەرانبەر بەخاڵی یەکەم، دەتوانین چەند کارێکی ئاڵۆز وەربگرین، لە دەمکاتی رانەبردوودا، وەك:

ئەوە دەژی : ئەوە دەگری

ئەوە دەکەوێ : ئەوە دەسووتێ

ئەوە دەنووسرێ : ئەوە دەنووسێ

ئەوە دەبڕێ : ئەوە هەڵی دەگرێ

لە ئەو هەشت نموونەیەدا، بە (بکەردیار) و (بکەر نادیار)ەوە و بە (تێپەڕ) و (تێنەپەڕ)ەوە، دەمکاتەکە رانەبردوەو بکەرەکەش کەسی سێیەمی تاکە[30]. گومان لەئەوەدا نیە کە هەر هەموو کاری زمانەکە بێجگە لە (بوون و هەبوون)، پاشگری دووپاتن کردنەوە (ەوە) وەردەگرن. ئەم پاشگرەیش بە (بزوێن) دەست پێ دەکات و ئەو بزوێنەیش دەتوانێت (زەبری بزوێن) بەکار بهێنێت و کلکی جێناوەکە بگرێت و بیهێنێتەوە سەر رۆخی لێوان، وەك:

ئەوە دەژێ (ێت)ەوە : ئەوە دەگرێ (ێت)ەوە

[30] بەرێزمان، ئەو نموونانە زۆر جیاوازن لە یەکتری، بەلام جێناوی کەسی سێیەمی تاك کۆیان دەکاتەوە.

ئەوە دەکەو (ێت)ەوە : ئەوە دەسووتێ (ێت)ەوە

ئەوە دەنووسرێ (ێت)ەوە: ئەوە دەنووسـ (ێت)ەوە

ئەوە دەبڕێ (ێت)ەوە : ئەوە هەڵی دەگر (ێت)ەوە

لە ئەم کردەوەیەدا، هەرچی تەمومژ هەیە، لە کاری (ژیان و گریان)دا و لە کاری تێنەپەڕی ئەلفیدا دەڕوێتەوە و ڕاست دەبێتەوە، چونکە جێناوەکە خۆی دەسەپێنێت بەسەر ڕستەکاندا (بە زەبری بزوێنەکە). بە ئەم چەشنە، ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە. لە ئەو نموونانەیشدا چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم:** ڕێژەی ڕانەبردووی کاری (ژیان) و کاری (گریان) زۆر شێواون، بەڵام لە ئەوێدا بە تەواوی ڕاست بوونەتەوە.

**دووەم:** لە ئەو نموونانەدا کە تێنەپەڕی ئەلفین، مۆرفیمی (ێ) دەرکەوتوە، بەڵام ئەم مۆرفیمە لەگەڵ دەنگی (ێ)ی بەرایی لە جێناوەکەدا ئاوێتە بوە.

بە ئەم چەشنە، دەبینین کە زمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە، چونکە لە ئەو نموونانەیشدا لابردنی ڕەگەزی (ەوە) و ڕێنووس کردنی جێناوەکە نابێت بە (ناڕێزمان). لەبەرانبەردا دەبێت بە ئاڕێشتکارییەکی ڕێزمانی بۆ زمانی نووسین، وەك:

ئەوە دەژی : ئەوە دەژیێت

ئەوە دەگری : ئەوە دەگریێت

ئەوە دەکەوێ : ئەوە دەکەوێت

ئەوە دەسووتێ : ئەوە دەسووتێت

ئەوە دەنووسرێ : ئەوە دەنووسرێت

ئەوە دەنووسێ : ئەوە دەنووسێت

ئەو هەڵی دەگرێ : ئەو هەڵی دەگرێت

### ٤:٣- ئەرکی ڕەسەنی ئامرازی (بۆ):

لە زمانەکەدا، ئامرازێکی پرسیار هەیە لە چەشنی (چی؟). ئەم کەرەستە بنجییە دەلکێت بە ئامرازی پەیوەندییەوە وەك (بەچی، بەچییەوە، بەچیدا، لەچییەوە، لەچیدا، بۆچی). ئەوەی سەیرە هەموو ئەو ڕوخسارانە ئاشکران، بەلاّم لە ئاستی ئامرازی (بۆچی)دا تەمومژ هەیە، چونکە ڕوخساری (بۆ) پەیدا بوە بۆ (پرسیار). تەنانەت، هەندێك لە ڕێزمانووسان لەگەلّ نیشانەکانی پرسیار ڕیزی دەکەن، وەك[31] لە نموونەی (١)دا پەیڕەوکراوە. لە ئەم نموونانەداو لە هەموو زمانەکەدا، دەتوانین ئامرازی بنجی پرسیار (چی) بکەین بەسەربار، وەك لە نموونەی (٢)دا پەیڕەوکراوە.

(١) بۆ (-) دەڕۆیت بۆ بازاڕ؟: نازانم بۆ (-) وا هار بوە؟

(٢) بۆ (چی) دەڕۆیت بۆ بازاڕ؟: نازانم بۆ (چی) وا هار بوە؟

سەرنجێکی ورد دەری دەخات کە ئەم کردەوەیە بریتییە لە ئارایشتکارییەکی ڕێزمانی دانسقە لە زمانی نووسیندا، چونکە کەرەستەی (بۆ) ئامرازی پرسیار نییە. لەئەم ڕووەوە، چەند جوان دەبوو کە هەر هەمووومان بۆ ئەم لارییە بگەڕێین و نەهێڵین هەر وا بە سووك و ئاسان زمانی نووسین پەرپووت بکرێت، چونکە زمانەکە خۆی خۆی ڕاست، بە ئەم چەشنە:

<u>یەکەم</u>: سەربارکردنی ڕەگەزی (چی) نەبوە بە هۆی لاریی ڕێزمانی.

<u>دووەم</u>: ڕاست کردنەوەی ئەو لارییە زۆر گشتییە و ئێمە هیچ نموونەیەکمان تووش نەبوە کە ئەو سەربارکردنە پەسند نەکات.

---

[31] لە زمانی نووسیندا، ئەگەر بۆ ئەم لارییە بگەڕێین، ئەوا چەندین نموونەی زەق و ئاشکرا دەدۆزرێتەوە. یان دەبینین کە چۆن جارێك نووسەر (بۆ؟) بەکار دەهێنێت و جارێکی تر (بۆچی؟).

**سێیەم:** ئامرازە بنجیەکانی پرسیار رێژەی کاری (بوون) پەسند دەکەن، وەك:

ئەوە چی یـ(ـە)؟ : ئەوە کێ یـ(ـە)؟

ئەوە چەند (ە)؟ : ئەو چۆنـ(ـە)؟

لە بەرانبەردا، ئامرازی (بۆ) ئەوە پەسند ناکات و ناتوانین بڵێین: (ئـەوە بۆیـە)، بەس دەتوانین بڵێین: (ئەوە بۆ چیـە؟). بەئەم چەشنە، دەبینین کە ئامرازی (بـۆ) بـریتی نیە لە ئامرازی پرسیار، بەڵکوو بریتیـە لـە ئـامرازێکی پەیوەنـدی، کـە لکاوە بـە ئـامرازی پرسیار (چی)ەوە.

## ٥،٣- جودا کردنەوەی دوو دەنگی/ی/:

لە نێـوان دوو نموونـەدا، وەك: (ئـەو وەسـتایەوە: ئـەو کێلاّیـەوە[٣٢])، جیاوازییـەکی گەورە هەیە لە هەردوو دەنگی/ی/دا. لەبەر ئەم هۆیانە:

**یەکەم:** کاری (وەستان) تێنەپەڕە و سێتە جێنـاوی (م، یـت، ـ، یـن، ن، ن) وەردەگرێـت بـۆ (بکەر) لە رابردوودا. واتە، لە ئێرەدا جێناوەکە نادیارە.

**دوەم:** کاری (کێڵان) تێپـەڕە و سـێتە جێنـاوی (م، ت، ی، مـان، تـان، یـان) وەردەگرێـت بـۆ بکەر لە رابردوودا. واتە، لە ئێرەدا جێناوەکە بریتیە لە (ی). ئەوەیش لە یاد نەکـەین کـە هەردوو کارەکە ئەلفین و لە دەمکاتی رابردووی نزیکدان.

**سێیەم:** بە لابردنی رەگەزی (ەوە)، ناوەڕۆکی خاڵی یەکەم و دوەم دەردەکەوێت، وەك:

[٣٢] ئەم جۆرە نموونەیە زۆر باس کراوە و میکانیزمەکەیان زۆر ئاشکرایە. مەبەستی ئێمە لەئەوەدایـە کـە بڵێین: میکانیزمی جێگۆڕکێ باری دروستی جێناوەکە ئاشکرا دەکات لە ئەوێدا.

ئەو وەستایەوە : ئەو وەستا (ـ)

ئەو کێڵایەوە : ئەو کێڵا (ی)

**چوارەم:** بەپێی خاڵی پێشوو دەبێت دەنگی/ی/ لە نموونەی (وەستایەوە)دا هەر (ناوگر) بێت و لە نموونەی (کێڵایەوە)دا، هەم (ناوگر) بێت و هەم (جێناو) بێت. واتە، جێناوی (ی)، کە نیمچە بزوێنە وەرچەرخاوە بە دیوی (نەبزوێن)دا و بوە بە (ناوگر) سەرەڕای ڕۆڵی بکەرایەتی.

**پێنجەم:** لە ئەم ئاستەدا، دەتوانین ئەو دوو ڕۆڵەی/ی/ لە ڕستەی (کێڵایەوە)دا جودا بکەینەوە، چونکە جێناوەکە جێگۆڕە و ئەگەر بزافی جێگۆڕکێ[٣٣] بخەینەکار، ئەوا دەنگی/ی/ باز دەدات، وەك (ئەو نەی کێڵایەوە). لە ئەم نموونەیەدا، جێناوی بکەر بازی داوە و دەنگی/ی/ ناوگر پەیدابوە لە جێگەکەی، بەڵام بە هەمان میکانیزمی ڕێژەی (وەستایەوە) .

بە ئەم چەشنە، دەبینین کە ڕێزمانەکە خۆی ڕێگای ڕاستی خۆی دەدۆزێتەوە و خۆی بارە لێڵەکان ڕاست دەکاتەوەو بە ئاشکرا هاوار دەکات و ناسنامەی ڕەگەزەکان بەجوانی ئاشکرا دەکات. لە ئەم نموونەیەدا، جێناوی (ی) وازی هێناوە لە ئەرکی ناوگرایەتی و ناوگری (ی) پەیدابوە لەجێی. ئەگەرنا، جێناوی (ی) بازی داوە بۆ سەر ڕەگەزی نەری (نە).

[٣٣] جێناوی (ی) لەخانەی [٦]دایەو ئەو خانەیە جێگۆڕە، وەك لە سەرتاپای نووسین و کتێبەکانی ئێمەدا دەرخراوە.

## ٦:٢- بەرەنجام و گفتوگۆ:

ئەم نووسینە زۆر سادەیە و لە ئەنجامی کاری ڕۆژانەوە هاتوەتە کایەوە. ئەو نموونانەی لە ئێرەدا باس کراون لە ئیشەکانی خۆماندا و لە ئیشی کەسانی تریشدا باس کراون، بەڵام مەبەست لە ئێرەدا ئەوەیە کە خزمەتی ناونیشانی نووسینەکە بکەین، کە بریتیە لە (زمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە). بە هیواین لە ئەم بەرەنجامەدا چەند خاڵێکی بەکەڵك بخەینە بەردەستی خوێنەران، وەك:

یەکەم: لەهەر جێیەك کە لێڵی دەربکەوێت لە ڕوخساری ڕەگەزە ڕێزمانیەکاندا، دەتوانین ئەو جەمسەرە دیاری بکەین کە تەم و مژدارە. بۆ نموونە، ئەگەر جەمسەرەکە (بزوێن) بوو، دەیخشێنین لە (نەبزوێن)ێك بۆ ئەوەی بە ڕوخساری تەواو دەربکەوێت. یان ئەگەر جەمسەرەکە (نەبزوێن) بوو دەیخشێنین لە (بزوێن)ێك تا بە ڕوخساری تەواو دەربکەوێت. لە ئەم ڕوانگەیەوە، ئەم هەل و مەرجە جوانترین کەرەستەیە بۆ ڕاست کردنەوەی ڕوخسارەکان[٣٤].

دووەم: لە ئەو نموونانەدا کە دەنگی (خپ) یان دەنگی (گۆ نەکراو) هەیە، پرۆسەی خشان لە (بزوێن) باشترین سەنگی مەحەکە بۆ دۆزینەوەی دەنگە نادیارەکە.

سێیەم: لەهەر جێیەکدا سەربارکردنی دەنگێك، یان ڕەگەزێك، ئەگەر نەبوو بە (نارێزمان)، ئەوا باشترین کەرەستەیە بۆ دۆزینەوەی وردە بابەتە ونکراوەکان. بۆ نموونە، دەتوانین دەنگی /ت/ بکەین بە سەربار لە ڕێژەی (دەکەوێ) و بی کەین بە (دەکەوێت). یاوەك، دەتوانین ڕەگەزی (چی) بار بکەین لە ئامرازی (بۆ) و بی کەین بە (بۆچی؟).

[٣٤] نەختێك لەپاشتر لە خاڵی چوارەم و پێنجەمدا، چالاکی ئەم میکانیزمە دەردەخەین لەچەند نموونەیەکدا.

چوارەم: لە ئاستی خاڵی یەکەمدا، کە لەسەرەوە باس کراوە، دەتوانین گفتوگۆیەک دابمەزرێنین لەسەر کاری (ژیان)، بۆ ئەوەی بتوانین روخساری ڕێژەی سواو (ئەو دەژی) بگێڕینەوە بۆ (ئەو دەژییێت)، بە ئەم شێوەیە:

١- ئێمە دەتوانین بڵێین (ئەو دەژی)، بەلام ناتوانین بڵێین (ئەو دەژییەوە) و دەتوانین بڵێین ئەو (دەژێتەوە). واتە، دەنگی /ت/ زیندوو کرایەوە.

٢- وەك، بنجەکەی ئەم کارە بریتیە لە (ژی)، بە فرێدانی نیشانەی رابردوو (ا) و نوونی چاوگ (ن)، دەبێت دەنگی/ێ/ فەراموش نەکرێت، وەك (ئەو دە|ژیـ|یـ|یێت)، چونکە ئەم کارە ئەلفییە و تێنەپەڕە مۆرفیمی دەمکاتی رانەبردوو/ێ/ هەڵ دەگرێت.

٣- لە رووی شیتەڵکارییەوە، دەتوانین ئەو رستەیە بە ئەم چەشنە شیتەڵ بکەینەوە (لە سەر باری ستوونی).

ئەو: بکەری جودا، خانەی [+٦]
دە : نیشانەی بەردەوامی، خانەی [+١]
ژی: بنجی کاری (ژیان)، خانەی [سفر]
یێ :/ێ/ی دەمکاتی رانەبردوو لە چاوگی ئەلفی تێنەپەڕدا، خانەی [-٣]
یێت: روخساری تەواوی جێناوی کەسی سێیەمی تاك، خانەی [-٧]

٤- لە ئەم ئاستەدا، بە زەبری کەرستەی (با)، ئەگەر رستەکە بکەین بە (نیازداری)، دەتوانین بڵێین (بابژییێت) لە جیاتی (بابژی).

٥- ئەو سێ دەنگە (ی، ێ، یێ) کە یەکیان گرتوە لە سێ خانەی جیاوازەوە (سفر، -٣، -٧)، دەتوانرێت بە بڕیارێکی باڵا یەکلایی بکرێنەوە، بەلام دەبێت هەموو کەسێك بنچینەی ڕێزمانەکەی بزانێت.

**سەرچاوەکان:**


١- د. شێرکۆ بابان، میکانیزمە بنەڕەتیەکانی ڕستە سازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون، هەولێر ١٩٩٧.

١. د. شێرکۆ بابان، چێوەی برگەی دەنگسازی، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٦)، دهۆك ١٩٩٨.

٢. مەسعود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی زمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی ١٩٧٦.

٣. د. محەمەد مەعرووف فەتتاح، ڕێنووسی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (٩)، بەغدا ١٩٨٢.

٤. ڕەئوف ئەحمەد ئالانی، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٢.

٥. نووری عەلی ئەمین، نیشانەکانی ڕێژە لەگەڵ فەرمانی ناسادەدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٠٧)، ١٩٨٥.

٦. د. وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، بەغدا ١٩٨٦.

٧. د. محەمەد مەعرووف فەتتاح، کار پۆلین کردن بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوی)، ژمارە (١٢١)، ئازاری ١٩٨٩.

# بابەتی چوارەم

# میکانیزمی زەبری بزوێن[٣٥]

## ٤:١- دەستپێك:

ئێمە لە گشت دەلیڤەیەکدا جەخت لە سەر ئەوە دەکەینەوە کە دەنگی (بزوێن) ناتوانێت بە گەرووی کۆئەندامی ئاخاوتندا تێ بپەڕێت بەبێ ئەوەی کە ببێت بە دەنگی دوەم لە پاش دەنگێکی (نەبزوێن). واتە هەر دەنگێکی (بزوێن) دەبێت دەنگێکی (نەبزوێن) پەیدا بکات، بۆ ئەوەی برگەیەکی (تەواو) ڕۆبنێت، کە بتوانێت لە تاقگەی زارەوە بفڕێت بەرەو گوێیی بیستەر. بە ئەم چەشنە، لە (چێوە)ی برگەی دەنگسازیدا، دەنگی (بزوێن) خانەی دوەم پڕ دەکاتەوە، بەلاَم لە پاش ئەوەی کە دەنگێکی (نەبزوێن) پەیدا دەکات بۆ ئەوەی لە خانەی یەکەمدا دای بنیشێنێت. لە ئەم ڕووەوە، گرێیەکی (لکان) پەیدا دەبێت لە نێوان (کلك)ی دەنگێکی (بزوێن) و (سەر)ی دەنگێکی (نەبزوێن)دا. ئەو جۆرە لکانە زۆر پتەوە، بە ڕادەیەك کە پساندنی دەبێت بە هۆی هەرەسهێنانی (دەردوو) ئاخاوتن. ئەو دەردوەی کە ترپەی برگە بچووکترین بەرهەمی کۆئەندامی ئاخاوتن پێك دەهێنێت. بە ئەم پێیە، دەبێت بەرهەمی ئەو کۆئەندامە (برگە) بێت، نەك تاکە دەنگی (بزوێن) یان (نەبزوێن)[٣٦]. سەبارەت بە ئەم جۆرە لکانە پتەوەی کە لە نێوان (بزوێن) و (نەبزوێن)دا هەیە، ئێمە زۆر کەڵکمان وەرگرتوە و کردوومانە بە (دەستەبەرە)یەك بۆ

---

[٣٥] گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٢)، ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە (٣٧ ٣٢).

[٣٦] بۆ نموونە، ئەگەر تاکە دەنگی نەبزوێن بە شێوەی فۆنیم گۆبکەین، وەك /ن/، ئەوا برگەیەکی سووك (CVo) گۆ دەکەین بۆ بزوێنی بزرۆکە. یان، ئەگەر تاکە دەنگی بزوێن بە شێوەی فۆنیم گۆبکەین، وەك /ا/، ئەوا هەمان برگەی سووك (CVo) گۆ دەکەینەوە بۆ بزوێنیەکە، بەلاَم بە کلکی دەنگێکی نەبزوێنەوە وەك دالی کلۆر، یان هێی سووك، یان دەنگی /h/ لە فەرەنسیدا.

ئەوەی (ڕێزمانەکە خۆی بە خۆی ڕاست بکەینەوە)[٣٧]. لە ڕاستیدا، ئەو لکانە وای کردوە کە ئەم خاڵانەی خوارەوە بە ئاسانی ڕاست بکرێنەوە، چونکە دەنگی (بزوێن) هێندە بە هێز و زەبرە، هەرچی دەنگێکی (نەبزوێن) کە بێبایەخ کرابێت، یان خپکرابێت، یان گۆ نەکرابێت، یان بە ڕەسەنی بریتبێت لە دەنگێکی خپ (silent)، دەی دۆزێتەوە، وەك:

یەکەم: لە ڕێژەی کاردا، وەك:

ئەو دەخەوێ : ئەو دەخەوێتەوە

بەم پێیە، بەزەبری بزوێنی /ە/ ، لە بەرایی ئاشگری دووپاتی (ەوە)دا، ڕوخساری جێناوەکە ڕاست دەبێتەوە و دەنگی /ت/ زاڵ دەبێت و کەس ناتوانێت خپی بکاتەوە، مەگەر زەبری بزوێنەکە لاببەین.

دوەم: لە نموونەیەکدا وەك (تۆ ناردووتە)، مۆرفیمی ئێستایی هەیە ڕوخساری ئەو مۆرفیمە بریتیە لە (ـە). لە ئێرەدا، ئەگەر سەری بزوێنێك بخشێت لە کلکی بزوێنی (ـە)، ئەوا چاوی بزوێنەکە کلکی ئەو دەنگە خپە دەبینێت، کە چاوی ئێمە نای بینێت. لە ئەم کردەوەیەدا، زەبری بزوێنەکە دەچەسپێت و بە ئاشکرا هاوار دەکات کە ڕوخساری ڕەسەنی مۆرفیمی (ـە) بریتییە لە (ـەت)، وەك: (تۆ ناردووتـەتـەوە). کەواتە، زەبری بزوێن باشترین کەرستەیە بە دەستی ڕێزمانزان و ڕێزماننووسەوە بۆ ساخ کردنەوەی ئەو کێشانەی پەیوەندییان هەیە بە فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژییەوە. بەکارهێنانی جۆرە کەرەستەی ئاوهایش پێویست بە پسپۆڕی و بە لێزانی دەکات.

[٣٧] وەك لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا کەڵکی لێ وەرگیراوە.

**٤ : ٢ ـ نموونەیەك لە شیتەڵکاریدا:**

لەلاپەڕەی (١٨)دا، لە کتێبی (دینامیزمی جێناوی لکاو لەرستەسازیدا)، کە لەساڵی ١٩٩٧دا بڵاوکراوەتەوە، هەڵەیەك رووی داوە کە لە ئیشی ئێمە ناچێت. ئێمە تا بتوانین ناهێڵین جۆرە هەڵەی ئاوها بە پاڵێوەرە ڕێزمانیەکەدا تێ بپەڕێت. ئەو هەڵەیەیش بریتی بوو لە (ئێمە گەیشتووینەتە ئەنجام). لە ئەوێدا، بە هەڵە ئامرازی (ـە) لە جێی ئامرازی (بە) دانراوە، ئەگەر نا دەبا بنووسرابا: (ئێمە گەیشتووین بە ئەنجام). لەگەڵ ئەوەیشدا، هەڵەیەکی چاپ رووی داوە و جێناوی (ین) بە (ن) نووسراوە و ئەمەش هیچ ناگۆڕێت لە کێشەکە. لەلایەکی ترەوە، جیاوازی نێوان ئەو دوو ئامرازە لە وەدایە کە: یەکەمیان (ـە) لەیەك دەنگی بزوێن، پێك هاتوە و بڕگە سووکەکەی ناتەواوە (ـە|QVo) و دوەمیان (بە|CVo) لە دوو دەنگ پێکهاتوە و بڕگە سووکەکەی تەواوە. لەئەوێدا، چەسپاندنی ئامرازی (ـە) بوە هۆی ئەوەی کە زەبری (بزوێن) خۆی بنوێنێت و مۆرفیمی ئێستایی بهێنێتە دەرەوە، ئێمە لەسەرەتادا و وامان دەزانی کە بە ناهەق زیندوو بومەتەوە، چونکە زینگەکەی هی ئەوە نییە و ئەو دیاردەییەیش دژ ناراستەیە لەگەڵ بنەمایەك کە پێشتر دامانابوو. وەك: (ئەگەر جێناوەکە لاچوو ئەودا مۆرفیمەکە دەردەکەوێت. بە واتای ئەوەی کە جێناوەکە و مۆرفیمەکە ناتوانن پێکەوە لە یەك جێدا دەربکەون). بەرانبەر بە ئەم بنەمایە، لەنموونەیەکدا، وەك: (ئێمە گەیشتووینەتە ئەنجام)، جێناوی داپۆشەر (ین) دەرکەوتوە و کەچی مۆرفیمی ئێستایی شان بەشانی لە ریزەکەدا دانیشتوە. ئەمەش وا دەکات کە بەو بنەمایەدا بچینەوە چونکە زەبری بزوێن وا دەکات کە هەردووك پێکەوە ریز ببن لە هەمان نموونەدا. کەواتە، نموونەی یەکەم، کە (هەڵە)یە، کەڵکی بەخشیوە و (تیۆری زەبری بزوێن)ی پتەوتر کردوە. بەڵام لە نموونەی دوەمدا (ئێمە گەیشتووین بە ئەنجام)، زەبری بزوێن لە ئارادا نیە تا بچەسپێت.

## ٤ : ٣ ـ زەبری بزوێن:

لە ئەم ساڵانەی دواییدا، چەند بارێکی لێڵ و تەمومژدار دەهاتە پێش چاومان لە ئاستی مۆرفیمی ئێستاییدا، وەك:

یەکەم: لەگەڵ رابردووی تەواوی تێپەردا، وەك (من ناردوومە)، لابردنی مۆرفیمی (ـە) دەبوو بە (نارێزمان). کەچی لەئاستی رابردووی تەواوی تێنەپەڕدا، وەك (من کەوتووم: من کەوتوومە)، دانان و دانەنانی مۆرفیمەکە هیچی نەدەگۆڕی لەبابەتەکە، هەر چەندە رستەی (من کەوتووم) رێزمانی ترە لە (من کەوتوومە).

دووەم: لە رێژەی رابردووی تەواوی (بکەر نادیار)دا دانانی مۆرفیمەکە دەبوو بە (نارێزمان)، وەك (من نێردراوم/ من نێردراومە).

سێیەم: لە ئاستی ئەو دوو نموونەیەی خاڵی دووەمدا، ئەگەر پاشگری دووپاتی (ەوە) بەکاربهێنین، ئەوا کێشە پەیدا دەبێت، چونکە، لە هیچەوە، مۆرفیمەکە بە تەواوی و بە دەنگە خپەکەوە دەهێتەوە سەر رۆخی لێوان، وەك: (من نێردراومەتەوە). لە ئێرەدا، ئەگەر مۆرفیمەکە گۆ نەکرێت، ئەوا لاسارییەکی رێزمانی دروست دەبێت، وەك: (من نێرراومەوە). لە ئاستی ئەم کێشانەدا، ئێمە بە هەڵەدا دەچووین، بەڵام لە کۆتاییدا رێزمانەکە خۆی خۆی راست دەکردەوە. لە ئەم رووەوە، ئێمە گوتوومانە: (لە ژێر هەر جێناوێکی پۆلی یەکەمدا مۆرفیمەکە داپۆشراوە). پاشان گووتومانە: (دەنگی بزوین بەزەبرە و دەتوانێت دەنگی خپ زیندوو بکاتەوە). لە ئەم دوو بنەمایەوە، رێزمانەکە خۆی راست کردوەتەوە، بەم چەشنە:

- وەك بزوێنی سەرەتای پاشگری (ەوە) برگەکەی ناتەواوە، لە سروشتی زمانەوە، بۆ دەنگێکی (نەبزوین) دەگەڕێت بۆ ئەوەی ناتەواوییەکەی بۆ بپۆشرێت.

- وەك بزوێنەکە لە ژێر جێناوەکەدا داپۆشراوە، پاشگری (ەوە) لە داوێنی دەنگە خپەکە /ت/ دەخشێت و دەری دەهێنێتەوە.
- وەك دەنگە خپەکە دەردەکەوێتەوە بە زەبری بزوێن، مۆرفیمەکە بە تەواوی دەر دەئاژنرێت، چونکە بەشێك لە پێکهاتە دەنگیەکەی کەوتوەتە ژێر زەبری بزوێنەوە.

بە ئەم چەشنە، مۆرفیمەکە بەتەواوی رزگار دەبێت لە چاوشارکێ و لەگەڵ ریزە جێناوەکە ریز دەبێت. ئەمەیش وادەکات کە بۆچوونەکەی ئێمە لەنگ بێت، کە تێیدا گوتومانە: (لە رێژەدا، جێناوەکە و مۆرفیمەکە ناتوانن پێکەوە دەربکەون). لە ئەم روەوە، هێزی بزوێن هێندە توندە دەتوانێت رووی راستی مۆرفیمەکە دەربخات و لەژێر جێناوەکە دەری بهێنێت. ئەمەیش ئەو بۆچوونە راست دەکاتەوە کە پێی دەڵێن: (لە ژێر هەر جێناوێکی پۆلی یەکەمدا مۆرفیمی ئێستایی بە داپۆشراوی هەیە). سەبارەت بە نموونەی: (ئێمە گەیشتووینەتە ئەنجام)، ئامرازی (ە) وەك بزوێنە و بزوێنیش بەزەبرە، دەنگی خپی /ت/ی دۆزیوەتەوە و پێوەی لکاوە. پاشان، وەك ئەو دەنگە خپە /ت/ بەشێکی رەسەنە لە مۆرفیمەکە، ئەو مۆرفیمە نەی توانیوە لەت ببێت و بە ناچاری بە روخساری تەواوی (ـەت) دەرکەوتوەتەوە و لە (داپۆشراوی) دەرباز بوە. پاشان، وەك جێناو داپۆشەرەکە (ین) هەیە و زبرەی بزوێنەکەیش هەر هەیە، هەردوو رەگەزەکە بەیەکەوە ریزکراون. بەم چەشنە، سەرنجێکی ورد دەری دەخات: کە دەنگی (بزوێن) چەند بە زەبرە و چەند چالاکە. هەر لەبەر ئەوەی بتوانێت بە زاردا تێبپەڕێت، بە هەموو نرخێك بەدوای دەنگە نەبزوێنە ونەکاندا دەگەڕێت. سەرەڕای ئەوەیش، دەتوانین بڵێین: تا (ناوگری ناوخۆیی) هەبێت، روو لە (ناوگری دەرەکی) ناکات.

## ٤ : ٤ ـ ناوگری (ی):

لەلای هەموو ڕێزماننووسان ئاشکرایە و زۆرجار باسکراوە کە ناوگرێك لەچەشنی (ی) لە نێوان دوو بزوێندا دەردەکەوێت. یان، لە ئێرەدا زەبری بزوێن خۆی نواندوە و دەنگی نەبزوێنی (ی)ی پەیداکردوە بۆ ئەوەی کەموکوورییەکەی کۆئەندامی ئاخاوتن قەرەبوو بکاتەوە. لەگەڵ هەموو ئەوەیشدا، ئەو ناوگرە /ی/ دوو سەرچاوەی هەیە، وەك:

یەکەم: دەنگی (ی) نیمچەبزوێن کە بریتیە لەجێناوی کەسی سێیەمی تاك. ئەو جێناوە بە زەبری بزوێن دەتوانێت، لەباری (بزوێن)ەوە وەربچەرخێت بۆ باری (نەبزوێن). واتە، زەبری بزوێن سەما بە ئەم جێناوە دەکات. وەك: (ئەو ناردی : ئەو ناردیەوە). بە ئاشکرا دیارە کە لەرستەی دوەمدا جێناوی (ی) بوە بە دەنگی (نەبزوێن) لە بەر ئەوەی بزوێنی /ە/ خشاوە لە کلکی و پێوەی نووساوە و جووتەدەنگی (یە)ی بەهەمهێناوە.

دوەم: لە جێیەکدا، کە نە نیمچە بزوێن و نە دەنگی گۆنەکراوە و نە دەنگی خپ هەبێت، ئەوا دەنگی نەبزوێنی (ی) لە دەرەوەی چێوەبەندی ڕستەکەوە پەیدا دەبێت هەردوو ناوگرەکە لە یەکتری دادەبڕێت، وەك: (ئەو ڕاوەستا ـ ئەو ڕاوەستایەوە). لە ئاستی ئەم نموونەیەدا، دەتوانین ببینین کە چۆن دەنگێکی /ی/ نەبزوێن لەسەرچاوەیەکی دەرەکیەوە پەیدابوە. بە بۆچوونی ئێمە، تەنها ئەو ناوگرە دەرەکییە بریتی نیە لە پرو پارچەی ناوەکی لەرەگەزە ڕێزمانیەکاندا، یان، دەتوانین بڵێین: کۆئەندامی ئاخاوتن ئەم کەرەستە (لەسەرپێ)یەی وەك (یەدەك) داناوە بۆ ئەو بزوێنانەی کە چاریان نیە و ناوگری ناوەکییان بەدەست نەکەوتوە.

## ٤ : ٥ ـ زەبری نیمچە بزوێن:

زۆرجار ئەو بزوێنە کە جێی مەبەستە بریتیە لە نیمچە بزوینی /ی/ و /و/. ئەو دوو دەنگە لە بزوێنی ڕەسەن بێ هێزترن و ئەو بەهرەیە هەڵ دەگرن کە بەپێی ژینگەکە ڕەنگ دەگۆڕن. واتە، ئەگەر سەری نیمچەبزوێن حشا لە کلکی (نەبزوێن)، ئەوا خۆی دەکات بە (بزوێن) و ئەگەرنا، وەك (نەبزوێن) ڕەفتار دەکات. ئەمە و چەند بارێکی تایبەتی هەیە کە نیمچە بزوێنی /ی/ زەبری هەیە و ناسنامەی بزوێنی ون ناکات و هەر بە (بزوێن) دەمێنێتەوە و ناوگر داوا دەکات، وەك:

یەکەم: ڕەگەزی ناوی واتایی (ی)، وەك (جوان : جوانی)، ڕەفتاری نیمچەبزوێن ڕەت دەکاتەوە و ئەوە پەسەند ناکات کە بە زەبرێکی بزوێنێکی تر ببێت بە (نەبزوێن). وەك: (زانا : زانا یی)، یان (دانا : دانایی).

دووەم: بەهەمان شێوازی خاڵی پێشوو، ڕەگەزی ئاوەڵناوی شوێن ئەم ڕەفتاری هەیە، وەك: (لادێ: لادێیی)، یان (سنە: سنەیی)، یان (شەقڵاوە: شەقڵاوەیی).

سێیەم: جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ی). لە نموونەیەکدا وەك (ئەوە برایەتی) ئەوە پەسەند ناکات کە لەجێی ڕەسەنی خۆی دابنیشێت. هەر لەبەر ئەوە نابێت بە (نەبزوێن) و ڕۆڵی ناوگرایەتی پەسەند ناکات و باز دەدات بۆ دواوە. لە ئەم کردەوەیەدا، بزوێنی /ی/ لە مۆرفیمی ئێستایی دەخشێت و دەنگی خپی /ت/ زیندوو دەکاتەوە و ڕیزەکە دەگۆڕێت بۆ ڕوخسارێکی نامۆ لەچەشنی (برایەتی). بۆ نموونە ئەگەر جێناوەکە کەسی سێیەمی کۆ با (یان)، بە ئاسانی دەگوترا (برایانە) و پارچۆلکەی (تی)ی دەرنەدەکەوت و تەمومژ نەدەهاتە کایەوە، ئەم ڕەفتارەی جێناوی (ی) گراوە بە (بەشی هەفتەم) لە کتێبی (بنچینەی ڕێزمانی کوردی/٢٠١٤).

## ٤ : ٦ ـ تێکچوونی بزوێن:

ئەم بەشە تەرخان دەکەین بۆ ئەو ئاوێتەبوونەی کە قەوارەی بزوێنەکان تێک دەدات. لە ئەم کارلێکەدا باڵێکی ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ بزوێنی /ێ/ یان بۆ بزوێنی /ۆ/، یان بۆ هەردووکیان پێکەوە. وەک:

دەشـ(ـۆ|ێـ)ـت: دەشـ(ـوا)ت

دەخـ(ـۆ|ێـ)ـت : دەخـ(ـوا)ت

لەئەم دوو نموونەیەدا، هەردوو بزوێنی /ۆ/ و /ێ/ داژەنراون و بزوێنێکی تر /ا/ و نەبزوێنێک/و/ پەیدابوون بەم چەشنە:

بزوێن + بزوێن ← نەبزوێن + بزوێنی تازە ← جووتەدەنگ (وا)

ئێستاش ئەگەر لە نموونەی یەکەمدا چەواشەکاری لەسەر کاری (شۆردن) هەڵ بگرین و بنجی (شۆر) بنووسین، ئەوا ئەم کێشەیە لەئارادا نامێنێت، وەک:

دەشۆ(ر) (ێت) ـ دەشۆرێت

یان ئەگەر باڵێکی ئەو شەڕە بکەین بە بزوێنێکی تر، وەک:

دەکەێت ← دەکات

دەگەێت ← دەگات

دەخەێت ← دەخات

دەبەێت ← دەبات

ئەوا هاوکێشەیەك دەچەسپێت کە تێدا هەردوو بزوێنەکە لەناو دەچن و دەنگێکی بزوێنی تازە پەیدا دەبێت، وەك:

(ـە) + (ێ) = (ا)

(بزوێن) + (بزوێن) = (بزوێنی تازە)

بە بۆچوونی ئێمە، هەردوو بزوێنی /ێ/ و /ۆ/ بزوێنی ڕەسەن نین و بڕتین لە بڕگەی (یە) و (وە) و بە کورتی و بە کرژی گۆکراون و ئەو دوو بزوێنەیان گردوکۆ کردوە و دوو بەڵگەیش هەیە بۆ ئەم گوتەیە.

یەکەم: بۆچی لە ئەو کێشانەی سەرەوەدا ئەو دوو بزوێنە هەڵ وەشاونەتەوە.

دوەم: ئەو دوو بزوێنە بە ئاسانی دروست دەبن لەسەر زار لە ئەم ڕستانەدا:

نامەکەی کردوەتەوە ـ نامەکەی کردۆتەوە.

ئەو ناردوویەتی ـ ئەو ناردوێتی.

بەم پێیە، زەبری بزوێن خۆی دادەسەپێنێت بە سەردا و وا دەکات کە دەنگی نوێ پەیدا ببێت لە شەڕەبزوێنەکەدا. کەواتە، وەك لە ئەم نموونانەدا هەردوو بزوێنی /ێ/ و /ۆ/ بتوانن وا بە ئاسانی پەیدابن، لەدژە ئاراستەدا دەتوانرێت هەڵ بوەشێنرێنەوە.

## ٤ : ٧ ـ بەرەنجام و گفتوگۆ:

- زۆرجار ڕێزماننووسان و زمانەوانان گفتوگۆ دادەبەستن لە سەر ئاوگری /ت/ و لە سەر پاشکۆیەکی وەك (تی)، کە دەنگی /ت/ هەڵدەگرێت. لە ئەو بارە تەمومژدارانەدا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ڕیزەکەدا هەیە و کلکەکەی لە سەری (بزوێن)ێك خشاوە و جووتەدەنگی بۆ سازکراوە. بۆ نموونە لە ئەم ڕێژانەدا (ناردویەتی، ناردوێتیوە، ئەم ناردۆتەوە، ...) دەنگی /ت/ هەیە و مۆرفیمەکە هەیە و ئاوێتە بوە و بەڵام دەنگە خپەکەی بە (زەبری بزوێن) لە ڕیزەکەدا ماوەتەوە. ئەگەرنا، دەتوانین ئەو ڕێژانە بە ئەم چەشنە ئارایشت بکەینەوە بە ڕێزمان:

ناردوێـ/ت/ی: ناردوو یـ(ـەت)ی

ناردوێـ/ت/ێوە: ناردوویـ(ـەت)ی (ەوە).

ئەم ناردۆ/ت/ەوە: ئەم ناردوو(ـەت)ەوە.

بەم شێوەیە، دەتوانین سەرنج بدەین و بزانین کە دەنگی (بزوێن) بەزەبرە و توندە، چونکە ئەگەر مۆرفیمەکەیش (ـە) ئاودیوبێت، ئەو کلکی دەنگی خپی /ت/ بەرنادات. لە ئەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین کێشەکە یەکلایی بکەینەوە و بڵێین: بۆ هیچ ڕوونکردنەوەیەك مەگەڕێن، چونکە مۆرفیمەکە لە ڕیزەکەدایە و ئەوەیش کلکەیەتی و بە (زەبری بزوێن) ئامادەکراوە بۆ شایەتی.

- نابێت ئاوەڕۆکی خاڵی پێشوو بە دەنگی /ت/، لە جێناوی (ێت) و (یت)دا، لێڵ بکرێت. میکانیزمی ئەو کێشەیە زۆر ئاشکرایە و دەنگی /ت/ لەگەڵ (بۆزوێن) و

بەبێ (بزوێن) هەر دەتوانێت لەڕیزەکەدا دەربکەوێت، بۆ نموونە، دەنووسرێت (دەکەوێ) یان (دەکەوێت)، بەڵام بە (زەبری بزوێن) هەر دەبێت بنووسرێت (دەکەوێتەوە). گومان لەوەیشدا نییە کە ئێمە دەنگی /ت/ لە ئەو جێناوانەدا هەردەم ڕێنووس دەکەین.

- زەبری بزوێن ئەو هەندە بەهێزە دەنگێکی خپی نێو مۆرفیمی ئێستایی داپۆشراو دەدۆزێتەوە و بە مۆرفیمەکەوە دەی هێنێتەوە نێو ریزەکە، وەك:

(١) شیلان نوستوە : شیلان نوستوەتەوە

(٢) ئێمە نوستووین : ئێمە نوستوینەتەوە

لە رستەی (١)دا، مۆرفیمەکە ئاشکرایە و (زەبری بزوێن) دەنگی حەشاردراوی /ت/ی تێدا دۆزیوەتەوە. لە رستەی (٢)دا، ئەو مۆرفیمەی کە دەنگی /ت/ی حەشاردوە لە گیرفاندا، خودی خۆیشی حەشاردراوە لە ژێر جێناوی (ین)دا. واتە، دەنگی /ت/ دووجار ون کراوە لە ریزەکەدا، جاری یەکەم لە گیرفانی مۆرفیمەکەدایە. و جاری دوەم لەگەڵ خودی مۆرفیمەکەدا لە گیرفانی جێناوی (ین)دایە. لە گەڵ ئەو دووجار ونبوونەدا، کەچی (زەبری بزوێن) دەی دۆزێتەوە. کەواتە، ئەگەر مۆرفیمەکە دەنگە خپەکەی لە گیرفاندا نەبا، ئەوا (زەبری بزوێن) نەی دەدۆزیەوە. بە ئەم پێیە کرۆکی کێشەکە دەنگسازییە و زەبری بزوێنەکە بۆ چاوی کاڵی مۆرفیمەکە ناگەڕێت، بەڵکوو بۆ چاوی کاڵی دەنگە خپەکە دەگەڕێت و لە ئەنجامدا مۆرفیمەکە، بە سایەی دەنگی خپی /ت/وە دەدۆزێتەوە و خزمەتێکی دانسقە پێشکەش دەکرێت بە ڕێزمانی رستەکان. لە نموونەی (١)دا، ئەم پرۆسەیە لە ئەوە دەچێت کە پارچە زێرێك لە نێو خشتێکدا ون بووبێت و ئەو خشتە بدەین لە ئامێری (زەبری بزوێن)، بۆ ئەوەی بزانین تێیدایە یان نا. لە رستەکەی دەستە

چەپدا بە (ئەرێ) وەڵامی داوەتەوە. لە نموونەی (٢)دا، خشتەکە لەنێو چەندین خشتی تردا ون بوە و بە هەمان ئامێری (زەبری بزوێن) یەکسەر بۆ زیرەکە دەگەڕێین، چونکە بە سایەی زێرەکەوە ئەو خشتە ئاشکرا دەبێت کە زێڕەکەی تێدا حەشاردراوە. لە ڕستەکەی دەستە چەپدا بە (ئەرێ) وەڵامی داوەتەوە، بەڵام بەم وەڵامە ئامێرەکە دەزانێت کە زێڕکە لە ئێرەیە و ئێمەیش تێ دەگەین کە خشتی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ژێر جێناوی (ین)دا حەشادراوە. واتە، ئەو خشتەی بۆی دەگەڕێین بریتیە لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) کە ون بوە لە لە نێو مۆرفیمەکاندا و دەنگی خپی /ت/یش بریتیە لە ئەو زێڕەی کە لە ئەو خشتەدا حەشاردراوە و ئەو ئامێرەیش کە بۆ زێرەکە دەگەڕێت بریتیە لە میکانیزمی (زەبری بزوێن)، کە وەك هەستەوەر (سەنسەر) بۆنی ئەو زێڕە دەناسێتەوە و لە پەراوێزی ئەو خزمەتە دەنگسازییدا، خزمەتێکی بێمەبەست پێشکەش دەکرێت بە ئاستی ڕێزمان.

- لە روخسارێکدا وەك (تی)، کە ناو ناوبراوە بە (مۆرفیمی بۆش)، یان بە (زیادەی ڕێزمانی)، دەنگی /ت/ دەگەڕێتەوە بۆ مۆرفیمی ئێستایی (ـە) و لەوێدا بە زەبری بزوێنی (ی) بووژێنراوەتەوە. بەرانبەر بە ئەم روخسارە (تی)، روخساری تر هەیە، وەك (تە، تێ). لە گشت نموونەکاندا، ئەگەر دەنگی /ت/ پەیدا بووبێت، ئەوا مۆرفیمەکە لە ریزەکەدایە و بە دیار و بە نادیار لە ژێر (زەبری بزوێن)دایە، بە ئەم شێوەیە:

یەکەم: ڕێژەکە لەرابردووی تەواودایە و نیشانەی رابردووی تەواو/و/ بەرجەستەیە لە ریزەکەدا.

دوەم: لە ژێر هەر جێناوێك لە چەشنی (م، ی، ـ، ین، ن، ن) مۆرفیمەکە هەیە بەڵام بە داپۆشراوی.

سێیەم: ئەو مۆرفیمە داپۆشراوە لە چەند (بزوێن)ێك خشێنراوە، وەك (ی، ـە، ێ) و ئەو کردەومیەیش بوە بە هۆی پەیدابوونی روخسارەکانی (تی، تە، تێ).

- بەپێی خاڵی پێشوو، بە بەراورد لەگەڵ ڕابردووی نزیک، دەتوانین لەرووبەری ڕابردووی تەواودا بگەڕێین، بۆ ئەوەی بە زەبری بزوێنەکەی ڕەگەزی (ەوە) مۆرفیمەکە بدۆزینەوە، وەك:

- ڕێژەی تێنەپەڕ:

(١): من کەوتووم: من کەوتوومە(تە)وە

(٢): من کەوتم: من کەوتمـ(-)ـەوە

- ڕێژەی تێپەڕ:

(١): من ناردوومە: من ناردوومە(تە)وە

(٢): من ناردم: من ناردومـ(-)ـەوە

ـ ڕێژەی بکەری نادیار (تێنەپەڕ):

(١): من نێرراوم: من نێرراومە(تە)وە

(٢): من نێررام: من نێررامـ(ـ)ـەوە

لە نموونەکانی (١)دا، واتە لە (ڕابردووی تەواو)دا، بە ئاشکرا و بەبێ جوداکاری دەنگە خپەکەی /ت/ دەرهێنراوە لەژێر جێناوی (م) و جووتەدەنگی (تە) دەرکەوتوە. لە بەرانبەردا، لەڕابردووی نزیکدا، واتە لە نموونەکانی (٢)دا، جووتەدەنگی (تە) دەرنەکەوتوە و دانانی بە زۆر دەبێت بەهۆی لاسارییەکی ڕێزمانی زۆر گەورە. لە بەرانبەردا، لادانی بڕگەی (تە) لە نموونەکانی (١)دا، جارێکی تر دەبێتەوە بە لاساریی. بۆ

سەلماندنی ئەو ڕاستی، لە خوارەوە هەر شەش ڕستە کراون بە ناتەبا* و بێ ڕێزمان، کاتێک کە ئەو ئاڵوگۆڕە پەیرەوکراوە.

- ڕێژەی تێنەپەڕ:

(١): من کەوتووم: من کەوتوومە(–)وە*

(٢): من کەوتم: من کەوتمـ(تە)ـەوە*

- ڕێژەی تێپەڕ:

(١): من ناردوومە: من ناردوومە(–)وە*

(٢): من ناردم: من ناردومـ(تە)ـەوە*

- ڕێژەی بکەری نادیار (تێنەپەڕ):

(١): من نێرراوم: من نێرراومە(–)وە*

(٢): من نێررام: من نێررامـ(تە)ـەوە*

کەواتە، زمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە و ئەو دەنگە خپەی کە لەنێو بیردا هەڵگیراوە هەموو تەمومژێك یەکلایی دەکاتەو و زمانەکە دەدات لە پاڵێوەری ڕێزمانی و دەی کات بە زمانێکی ڕێزماندار. بۆزانین، لە پێش چەسپاندنی (زەبری بزوێن)، واتە لە نموونەکانی لای ڕاستدا، هیچ ئاسەوارێکی دەنگسازی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) و دەنگە خپەکەی /ت/ لە ئارادا نیە، بە لام لە پاش چەسپاندنی (زەبری بزوێن)، واتە لە نموونەکانی لای چەپدا، هەردوو پێکهاتەکەی مۆرفیمی ئێستایی بە جوانی دەرکەتوون.

- لە ڕێزمانەکەدا، ئەگەر (زەبری بزوێن) بکەین بە (سەنگی مەحەك)، ئەوا دەتوانین زۆر وردەکاری ڕێزمانی ڕاست بکەینەوە و ڕوخساری ڕەسەنی ڕەگەز ڕیزمانیەکان دیاری بکەین. بۆ نموونە، دەتوانین (زەبری بزوێن)، وەك سەنگی مەحەك، لە ڕێژەیەك بخشێنین وەك (دەخوا) بۆ ئەوەی دەنگی /ت/ ببوژێنینەوە و بڵێین

(دەخواتەوە). واتە، نووکی بزوێن کلکی جێناوەکە دەدۆزێتەوە، هەرچەندە کە سەری جێناوەکە /ێ/ لە ژینگەیەکی تردا نابووت بوو بێت و بووبێت بە /ا/. کەواتە، زەبری بزوێن هێندە بەزەبرە، دەتوانێت لە ڕێژەی (دەخوا)دا، کە هەردوو جەمسەری جێناوەکە ناودیوکراوە، دەنگی /ت/ بدۆزێتەوە، بۆ نموونە، لە ڕێژەی (دەخواتەوە)دا هیچ دەنگێك پەسەند نیە بۆ جێی ناوگری /ت/ تەنها خۆی نەبێت، چونکە بە پێی (زەبری بزوێن)یش هەر دەگوترێت (دەخوات). پاشان، لە نموونەیەکدا، کە دەنگێك بە لێفەی سالگار داپۆشرابێت، وەك دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا، ئەوا ئەو زەبرە هەر دەی دۆزێتەوە، وەك دەگوترێت (ناردوومە: ناردوومەتەوە). لە ئەم نموونەیەیشدا ڕێزمانەکە دەشێوێت ئەگەر دەنگێکی دی دابنرێت لەجێی ناوگری /ت/. کەواتە، زەبری بزوێن هێندە بەهێزە دەنگی خەپ بە ئاسانی دەدۆزرێتەوە، لە ئەو کونجەدا کە تێیدا حەشاردراوە. لە ئەم ڕوانگەیەوە، هەرچەندە کە نەگوترێت (ناردوومەت)، بەڵام زەبری بزوێنەکە دەگات بە ئەو ڕۆژەی کە تێیدا دەنگی /ت/ خەپ کراوە و ژینگەیەکی تر دروست دەکات بۆی. بەڵام، هەرکە دەستی لێ بەر بدات، واتە زەبری لەسەر لا بدات، ئەوا دەچێتەوە بۆ ژێر لێفەکەی مێژوو. پاشان ئەگەر ئەو دەنگە خەپە نەبێت، ئەوسا دەنگێکی ئاشکرا دەپچڕێت لە کلکی ئەو مۆرفیمەی کە دەکەوێتە پێشی وەك دەنگی /ش/ لە وشەی (پێش)، لە ناوی (پێشەوا)دا. یان ئەگەر ئەو هەل و مەرجەیش نەڕەخسا، ئەوا داوای ناوگرێکی دەرەکی دەکات، کە لە دەرەوەی قەوارەکەوە پەیدا کرابێت، وەك دەنگی /ی/ لە (وەستایەوە)دا. بەم پێیە، دەتوانین بڵێین: زەبری بزوێن لە سەری بزوێندایە و ئەو سەرە بۆ کلکی (نەبزوێن)ێك عەودالە و سەوداسەرە، بۆ ئەوەی بلکێت بە کلکیەوە و (جووتەدەنگ) چێ بکات، تا بتوانێت بە باجگەی زاردا تێ بپەڕێت بە پێناسەی (جووتبوون)ەوە، چونکە شەرتە و بەبێ ئەو شەرتە کۆنترۆڵی زار قفڵ دەبێت و بە ڕوویدا ناکرێتەوە. لە ئەم

پرۆسەیەدا، دەنگێکی (نامۆ) جووت دەبێت بە سەری بزوێنەکەوە، بە پێی ئەم ژێدەرانەی خوارەوە:

یەکەم: لە ژێدەرێکی ئاشکراوە: بۆ نموونە، سەرچاوەی دەنگی /ش/ لە جووتە دەنگی (شە)، لە وشەی (پێشەوا)دا، ئاشکرایە.

دووەم: لە ژێدەرێکی نیمچەئاشکراوە: بۆ نموونە، سەرچاوەی دەنگی /ت/ لە جووتە دەنگی (تە)، لە وشەی (دەخواتەوە)دا، نیمچە ئاشکرایە، چونکە نە کەوتوەتە ئەو دیوی پەردەی بیرەوە و هەموو کەسێك دەزانێت ئەو دەنگە هەیە، بەس تەمبەڵ و لەش قورسە لە گۆکردنی ئاساییدا.

سێیەم: لە ژێدەرێکی نائاشکراوە: بۆ نموونە، سەرچاوەی دەنگی /ت/ لە جووتە دەنگی (تە)، لە وشەی (وەستاوەتەوە)دا، نائاشکرایە، چونکە کەوتوەتە ئەو دیوی پەردەی بیرەوە و هەموو ڕێزماننووسێك نازانێت ئەو دەنگە هەیە و بەشێکە لە پێکهاتەی بنیادی مۆرفیمی ئێستایی، بەس ڕۆژگار بە تەواوی خپی کردوە لە گۆکردنی ئاساییدا و هەر لە ژێر زەبری بزوێندا گۆ دەکەرێت. بێگومان، تا ئێستا ڕێزماننووسانی بێخەبەرن لە ئاستی ئەم کەشکەکە.

چوارەم: لە ژێدەری خلیسکە بزوێنەوە، ئەگەر هەردوو بزوێنی /ە/ و /ا/ بخشێن لە کلکی هەردوو خلیسکە بزوێنی /ی/ و /وو/، ئەوا برگەکەی دەگۆڕن بە (برگەی لێکدراو)، چونکە خلیسکە بزوێنەکە جووتە دەنگی هەیە، بەلام زەبری بزوێنەکە دەی کاتەوە بە (نەبزوێن) و جووتەدەنگێکی تازەی لە تەکدا چێ دەکات. بۆ نموونە، وەك گۆکراوی (دیە|c.CVo) و (بوە|c.CVo) لە (ناردی: ناردیەوە) و (بوو بە ئاو: بوەوە بە ئاوە)دا. لە کاتی نووسینەوەی ئەم بابەتەدا (١٩٩٩)، ئەم ڕاستیە نەختێك دەڵەمە و شلوشاو بوو، بەلام لە

دواتردا خۆی گرت و مەیی و بلووری بەست و بوو بە (بابەت). تەنانەت، لە ساڵی ٢٠١٥دا پێشنیارمان کرد کە ئەو جۆرە برگەیە بە یەك /ی/ یان بە یەك /و/ ڕێنووس بکرێن، چونکە ئەو دەنگە لە ئەوێدا لە دیوی (نەبزوێن)دان و نەبزوێنیش بە یەك پیت ڕێنووس دەکرێت.

پێنجەم: لە ژێدەرێکی دەرەکیەوە، بۆ نموونە، سەرچاوەی دەنگی /ی/ لە جووتە دەنگی (یە)، لە وشەی (وەستایەوە)دا، دەرەکیە، چونکە دەنگێکی یەدەکە و گشت کاتێك (لەسەرپێ)یە و داشی سوارە، بۆ ئەو چرکەساتەی کە هیچ چارەسەرێك دەست نەکەوێت بۆ کێشەی (زەبری بزوێن).

بە کۆی ئەو خاڵانەی پێشەوە، تەنها بابەتی (خاڵی پێنجەم) بریتیە لە (ناوگری ڕەسەن)، چونکە ئەوانەی لە خاڵەکانی تردا کراون بە (ناوگر) بریتین پڕوپارچەی کلکی ئەو مۆرفیمە ڕێزمانیەی کە کەوتوەتە پێش بزوێنەکە.

**سەرچاوەکان**

**١ـ د. شێرکۆ بابان، کتێبی "میکانیزمە بنەڕەتییەکان ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون" هەولێر ١٩٩٧.**

**٢- د. شێرکۆ بابان، دانامیزمی جێناوی لکاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧.**

**٣- د. شێرکۆ بابان، دەنگی خپ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر ١٩٩٧. (بابەتی یەکەم).**

**٤- د. وریا عومەر ئەمین، مردنی وشە، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٤٥)، ساڵی ١٩٨٦.**

**٥- د. وریا عومەر ئەمین (لە یاسا دەنگیەکانی زمانی کوردی) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (١٣٨) بەغدا ١٩٩٦.**

**٦- د. محەممەد معروف فەتاح، نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد، ژمارە (٩)، ساڵی ١٩٨٢.**

**٧- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.**

8. Bescherelle 3, *la gramaire pour tous*. Hatier, Paris 1980.

9. M. Swan & F. houdart. Pratique de l englais de A a Z. Hatier. Paris 1983.

# بابەتی پێنجەم

# دوو ڕەگەزی ڕێزمانی بە بەراورد[٣٨]

## ١:٥- دەستپێك:

لە ڕێزمانی زمانەکەدا، چەند ڕەگەزێکی ڕێزمانی هەیە، کە بە روخساری (ـە) دەردەکەون. تەنانەت، هەندێك لە ڕێزماننووسان بە وردییەوە لێی دواون و لێکیان داوەتەوە. ئەو جۆرە ڕەگەزانە زۆرن و زۆر بەرفراوانن لە ڕێزماندا. سەبارەت بە ناونیشانی ئەم نووسینە، ئێمە تەنها دوانیان بڕ دەکەین و ئەمجار ڕوو دەکەین لە خاڵەکانی بەراورد و یەکسانی لە نێوانیاندا. ئەو دوو ڕەگەزەیش بریتین لە مۆرفیمی نێستایی (ـە) و لە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە). هۆی ئەم بەراوردەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم راستییانەی خوارەوە:

**یەکەم:** هەردوو ڕەگەزەکە بە روخساری ڕەواڵەتی و لە ژینگەی ڕێزمانی ئاساییدا بە روخساری رووتی (ـە) دەر دەکەون[٣٩].

**دوەم:** هەردوو ڕەگەزە ڕێزمانییەکە سیمای (کەس)یان پێ بەخشراوە لە ڕێزمانی نووسراودا. بۆ نموونە، بە مۆفێمی نێستایی (ـە) دەگوترێت جێناو، یان ڕێژەی کەسی سێیەمی تاك لە کاری (بوون)دا و بە ئەو ڕەگەزەکەی دیکە دەگوترێت جێناوی کەسی دوەمی تاك لە ڕێژەی فەرماندا[٤٠].

---

[٣٨] گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (٢)، ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە (٦٧-٧٢)

[٣٩] بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١) بۆ زانیاری بەرفراوانتر لەسەر دەنگی خپ لەئەو دوو مۆرفێمەدا.

[٤٠] لەزۆربەی سەرچاوە ڕێزمانییەکاندا، ئەو گوتەیە تۆمار کراوە. ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین کە مۆرفیمی نێستایی بەرانبەر بە کەس و ژمارەی کەس دابنرێت. واتە، ئەو ڕەگەزە (جێناو) نیە و نابێت لەگەڵ (جێناودا)دا ریز بکرێت.

**سێیەم:** هەردوو ڕەگەزەکە ئاکاری سنتاکسی دەبەخشن و ئەرك ڕێزمانی دەخرێتە پاڵیان لە ریزی ڕستەدا.

**چوارەم:** هەرچەندە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە) برەوی زۆر نەبێت لە بەکار هێناندا، بەڵام مۆرفیمی ئێستایی (ـە) زۆر زۆر چالاك و بەربڵاوە لە رووبەری زمانەکەدا. ئەمەیش وا دەکات کە دەرفەتێکی دی برەخسێت بۆ ناساندنی ڕۆڵی گرنگی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە چیکەنە سنتاکسییەکەدا[41].

**پێنجەم:** هەوڵدان لە پێناوی ئەو مەبەستەدا، کە ناسنامە و پسوولەی (جێناو) لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) وەربگرینەوە. واتە، دژی ئەو بیروڕایە بوەستین کە ڕێزماننووسان دەری دەبڕن و لەنێو خشتەی جێناوەکان ریزی دەکەن و دەی خەنە نێو جامخانەی کەس و ژمارەی کەس، لە ئاستی کەسی سێیەمی تاکدا.

به ئەم شێوەیە و بە ئەم کۆمەکەوە، خۆ دەکەین بە (ناکۆك) لە هەندێك بیر و بۆچووندا و مەبەستی خۆمان دەخەینە ڕوو. ئەمە و ئەم بابەتانەی خوارەوە ئەو خاڵانەیە کە ڕێی خوێنەر ڕوون دەکەنەوە لە ڕێزمانی تەمومژداری ئەو دوو مۆرفیمەدا.

## ٢:٥- هەڵگرتنی دەنگی خپ:

لە نووسینێکدا کە لە ساڵی ١٩٩٧دا بڵاوکراوەتەوە[42]، ئێمە ئەوەمان دەرخستوە کە ئەو دوو مۆرفیمە، هەرچەندە بە روخسار و بە ڕواڵەت یەکسان بن بە بزوێنی /ـە/، بەڵام بە ڕوخساری ڕەسەن و بنجی لە یەکتری جودادەبنەوە. یەکەمیان دەنگی خپی /ت/ هەڵ دەگرێت و روخسارە بنجییەکەی دەبێت بە (ـەت) و دوەمیان دەنگی خپی /ر/ هەڵ دەگرێت و دەبێت بە (ـەر)، وەك:

---

[41] لە سەرچاوەی (٢)دا، لەبەشی هەشتەم و نۆیەمدا بەوردی بەخشتە و بە نیگار لە سەر مۆرفیمی ئێستایی دواوین. ئەوەی مەبەستی بێت دەتوانێت بگەرێتەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە.

[42] بڕوانە بۆ (بابەتی یەکەم) لە ئەم کتێبەی بەردەستدا.

- ئەو ڕۆیشتو(ە) :     ئەو ڕۆیشتو(ەت)ەوە
- تۆ بخەو (ە)   :   تۆ بخەو (ەر) ەوە

لە ئەویدا، هەردوو ڕستەکەی لای ڕاست لە ژینگەی ڕێزمانی ئاساییدان و هەردوو ڕەگەزەکە بە ڕوخساری ڕواڵەتی (ـە) دەرکەوتوون. لە دوو نموونەکەی تردا، ژینگە ڕێزمانیەکە شێوێنراوە بە ئاژاوەی بزوێنێکی ڕووت (ـە)، لەبەرایی ڕەگەزی دووپات کردنەوە (ەوە)دا. لەئەم ئاستەدا، دەردەکەوێت کە هەردوو ڕوخسارەکە گەڕاونەتەوە بۆ سەر ڕەسەنی خۆیان و دوو دەنگی خپیان دەرخستوە. یەکەمیان، دەنگی /ت/، کە مۆفیمی ئێستایی (ـە)ی کردوە بە (ـەت) و دوەمیان دەنگی (ر)، کە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە)ی کردوە بە (ـەر). کەواتە، دەتوانین دەرگای یەکسانی و جوداوازی بکەینەوە لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا، بەم شێوەیە:

<u>یەکەم</u>: هەردوو ڕەگەزەکە ڕوخساری ڕواڵەتیان هەیە و ڕوخساری بنجییان هەیە. واتە، یەکسانن لە ئەم ئاکارەدا و خۆ جودا دەکەنەوە لە ڕەگەزە ڕێزمانیەکانی تر[٤٣].

<u>دوەم</u>: لە ڕوخساری ڕواڵەتیدا، هەردووك یەکسانن بە بزوێنی /ـە/ و لە ڕوخساری بنەڕەتیدا جیاوازن. واتە، هەرچەندە هەردووکیان دەنگی خپ هەڵ بگرن بەڵام دوو دەنگی نەبزوێنی جیاواز هەڵ دەگرن.

<u>سێیەم</u>: بە پێی ئەوەی گوترا، ئەم دوو ڕەگەزە لاپەڕەیەکی نوێ دەکەنەوە لە ئەتڵەسی زمانەکەدا. ئەو لاپەڕەیەش بریتیە لە (دەنگی خپ). لەئەم ڕوانگەیەوە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکانی سەرەوە، دەبینین کە هیچ دەنگێکی دی نیە، کە بتوانێت جێی ئەو دەنگە بگرێتەوە، یان ئەگەر لا ببردرێن، چێوەی ڕستەکان تێك نەچێت. تەنانەت، ناتوانین هەردوو دەنگە خپەکە بخەینە جێی یەکتری لە هەردوو نموونەکەدا.

---

[٤٣] هەتا ئێستا (٢٠١٥/٥/٢٦) هەر لە ئەم دوو ڕەگەزەدا دەنگی خپ ئاسراوەتەوە.

### ٣:٥- ئاکاری جێناو:

لە ڕێزمانەکەدا، هەردوو ڕەگەزەکە بە جێناو ناوبراون و زۆر جار لەگەڵ ریزە جێناوەکان خشتە ڕێزکراون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاکارانەی کە لە ئەم دوو نموونەیەدا هەن، وەك:

ئەو ڕۆیشتوو (ە) : تۆ بخەو (ە)

لەرووی کەسەوە، رستەی یەکەمیان بەرانبەر بە کەسی سێیەمی تاك وەستاوە و دوەمیان بەرانبەر بە کەسی دوەمی تاك وەستاوە. لە رووی ئەرکەوە، هەردوو ڕەگەزەکە لە ئەرکی (بکەر)دان. لەراستیدا، ئەوەی گوترا تەنها هەر جێناوی ریزەی فەرمان (ـە) دەگرێتەوە. واتە، تەنها هەر ئەومیان سیمای کەس و ژمارەی کەس هەڵ دەگرێت و لە کەسی دوەمی تاك جودا نابێتەوە. بۆ نموونە، وەك فەرمانی ڕاستەوخۆ هەر بەسەر کەسی دوەمدا دەدرێت ناتوانین بڵێین: (ئێوە بخەوە*). ئەمەش لەبەر ئەوەی ژمارەی کەسەکە گۆڕاوە بۆ (کۆ). لە بەرانبەردا، لە ڕۆڵی (بەرکار)دا، مۆرفێمی ئێستایی بەرانبەر بە هەموو کەسەکان دەر دەکەوێت، لە ئەم سێتە نموونەیەدا:

- ئەوان (من) یان خستو(ە)
- ئەوان (تۆیان) یان خستو(ە)
- ئەوان (ئەم)یان خستو(ە)
- ئەوان (ئێمە)یان خستو(ـە)
- ئەوان (ئێوە) یان خستو(ـە)
- ئەوان (ئەمان) یان خستو(ـە)

- لە ئەو نموونانەدا چەند ڕاستییەك هەن وەك:

**یەکەم:** ڕۆڵی بکەری لە هەر شەش ڕستەکەدا بریتیە لەکەسی سێیەمی کۆ (ئەوان).

**دوەم:** ڕۆڵی بەرکار لەهەر شەش ڕستەکەدا، بەسەر هەر شەش کەسەکەدا (مـن، تـۆ، ئـەم، ئێمە، ئێوە، ئەمان) دابەش کراوە.

**سێیەم:** مۆرفیمی (ـە) لەگەڵ هەر شەش کەسەکەدا دەرکەوتوە.

**چوارەم:** بەپێی ئەوەی گوترا، زۆر ئەستەمە و ناڕەوایە ئەگەر سیمای (کەس) و (ژمارەی کەس) بکەینە بەر مۆرفێمی ئێستایی. واتە، ئەو مۆرفیمە ناگەڕێتەوە بۆ کەسی سێیەمی تاك.

**پێنجەم:** بەپێی خاڵی پێشوو، وەك کەس و ژمارەی کەس لە ئەو ڕەگەزەدا نەبێت، ئەوا ئەو کەرەستەیە (جێناو) نیە[44].

**شەشەم:** ئەگەر یەکێك خۆی دڵنامۆ بکات لەئەوەی کە فۆنیمی /ـە/ لە ئەو شەش نموونەیەدا مۆرفیمی ئێستایی نەبێت، دەتوانێت ڕەگەزی دووپات کردنەوە (ەوە)، لەهەر شەش ڕستەکە بار بکات و لە هەر شەش بارەکەدا ڕوخساری بنەڕەتی (ـەت) بدۆزێتەوە[45].

**حەوتەم:** بە ئەم پێیە، ڕەگەزی فەرمان (ـە) دەتوانێت پسوولەی (جێناو) وەربگرێت بۆ کەسی دوەمی تاك. لە بەرانبەردا، مۆرفیمی ئێستایی ناسنامەی (جێناوی کەسی سێیەمی تاك)ی لێ دەسەنرێتەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بریتیە لە خاڵێکی جیاوازی لەنێوان هەر دوو ڕەگەزە ڕێزمانیەکەدا.

---

[44] واتە، ئیتر بۆچی لەگەڵ جێناودا ریزی بکەین و بە جێناوی بناسین.

[45] ئەو میکانیزمەی کە ئەو دەنگە خپانە دەناسێتەوە و ناونراوە (میکانیزمی زەبری بزوێن)، لە ژمارەی (١٣٢) گۆڤاری (کاروان)دا بلاوکراوەتەوە، ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە (٣٢-٣٧). لە ئەم کتێبەی بەردەستدا، ئەو نووسینە کراوە بە (بابەتی چوارەم).

## ٤،٥- لێڵی و تەم و مژ:

لەبڕگەی پێشوودا، ئەوە دەرخرا کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بـریتی نیـە لـە (جێنـاوی کەسی)، بـەڵام ئـەوە دەرنـەخرا، کـە بۆچـی ئـەو مۆرفێمـە نووسـاوە بـە بـاڵای کەسـی سێیەمی تاکەوە. لەڕاستیدا، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو شـەش نموونـەیـەی نێـو بڕگـەی پێشوو و بەرکارە جوداکان (م، تۆ، ئەم، ئێمە، ئێوە، ئەمان) بکەین بـە (جێنـاوی لکاو)، دەبینین کە مۆرفیمی (ـە) لە هـەموو کەسـەکاندا دادەپۆشـرێت و دەرناکـەوێت، کەچـی تەنها لەکەسی سێیەمی تاکدا، داناپۆشرێت و دەر دەکەوێت، وەك[٤٦]:

ئەوان (من) یان خستو(ە) : ئەوان (خستوو(یان) (م) ( – )

ئەوان (تۆ) یان خستو(ە) : ئەوان خستوو (یان) (یت) ( – )

ئەوان (ئەم) یان خستو(ە) : ئەوان خستوو (یان) ( – ) (ـە)

ئەوان (ئێمە) یان خستو(ە) : ئەوان خستوو (یان) (ین) ( – )

ئەوان (ئێوە) یان خستو(ە) : ئەوان خستوو (یان) (ن) ( – )

ئەوان (ئەمان) یان خستو(ە) : ئەوان خستوو (یان) (ن) ( – )

بە سەرنجێکی ورد لە ئەو نموونانە، دەر دەکەوێت کە تەنها و تەنها لە کەسی سێیەمی تاکدا مۆرفیمەکە داناپۆشـرێت، ئـەوەیش لەبـەر ئـەوەی جێناوەکە نادیـارە. ئەمـەش ئـەو ڕاستییەیە کە بەرچاوی ڕێزمـان نووسـانی تـەماوی کـردوە و وا دەزانـن کـە ئـەو مۆرفیمـە جێناوەو دەگەڕێتەوە بۆ کەسی سێیەمی تاك. کەواتە، لەباری ئاساییدا، نادیـاری جێنـاو وا دەکات کە ئەو مۆرفیمە لە کەسی سێیەمی تاك دانەپۆشـرێت و دەربکـەوێت لـە ڕیزەکـەدا، وەك:

---

[٤٦] ئەم بابەتە ڕەنگە چەندین جار دوو بارە ببێتەوە، بەڵام ئێمە تا بە تەواوی دەچەسپێت و دەسەپێت هەر دەیڵێینەوە.

| | | |
|---|---|---|
| ئەو | زیرەك | (ـە) |
| ئەو | هە | یـ (ـە) |
| من | هە | مـ (ـە) |
| ئەو | کەو توو | (ـە) |
| من | خستوو | مـ (ـە) |

لە ئەم ئاستەدا، تۆ بڵێیت، ئەتوانین تـەم و مـژ و لێڵی لـە بـەر چاو بڕەوێنینـەوە و بڵێین: مـۆرفیمی ئێستایی بەرانبـەر بـۆ هـەر شـەش کەسـەکە هەیـە، بـەڵام لـە ژینگـەی ئاسـاییدا تـەنها لەکەسـی سـێیەمی تاکـدا دەر دەکـەوێت. لـە بەرانبـەردا، ئەگـەر ژینگـە ڕێزمانیەکە بڕەخسێنرێت، ئەوا نهێنیە لە تەم و مژ و لە لێڵی دەرباز دەبێت.

### ٥،٥- ڕووبەرە ڕێزمانیەکان:

ئێمە لە هەموو جێگەیەکدا داکۆکی و داکۆشان دەکەین، لەسەر ئەو ڕاستیەی کە ڕووبەری (فەرمانی ڕاستەوخۆ) بریتیە لە گیرفانێکی تایبەتی لە ڕێژەی بنەڕەت (ڕێژەی ڕانەبردوو). بە ئەم پێیە، جێناوی ڕێژەی فەرمان تەنها و تەنها هەر لە ئەو ڕوو بەرەدا هەیە، وەك:

تۆ بکەو (ە):     تۆ بنێر (ە)

لە ئەم ڕوەوە، ئەگەر هەموو ڕووبەری زمانەکە پەی بکەین ناتوانین لـە ناوچـەیەکی تـردا بی دۆزینـەوە. بەرانبـەر بـە ئـەم ڕاسـتییەش، مـۆرفیمی ئێسـتایی (ـە) دەتوانێـت لـە دوو ڕووبەری ڕێزمانیدا دەربکەوێت:

**یەکەم :** ڕوو بەری ڕانەبردووی تەواو، وەك:

ئەوە هەیـ (ـە) : ئەوە پیاو (ە)

**دووەم:** ڕووبەری ڕابردووی تەواو، وەك:

ئەوە نوستو(ە): ئەوە نوسراو (ە): ئەوە سوتێنراو (ە)

بە ئەم چەشنە، دەبینین کە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە) ناتوانێت سنووری ڕێژەی (ڕابردوو) ببەزێنێت، کەچی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە سوکی و بە ئاسانی ڕوو دەکات لە سەرپاکی ڕێژەی (ڕابردووی تەواو) و لەهەموو کەسەکاندا. بۆ نموونە، لەگەڵ کەسی یەکەمی کۆدا هەیە، بەڵام داپۆشراوە و ئەگەر زەبری بزوێنێك بخەینە کار، دەتوانین هەر بە ئاسانی دەری بکەین لە ئەم سێ نموونەیەدا:

ئێمە نووستوو (ین) (ـەت) ەوە

ئێمە نووسراو (ین) (ـەت) ەوە

ئێمە سووتێنراو (ین) (ـەت) ەوە

لەئەم ئاستەدا ئەگەر مۆرفیمەکە گۆ نەکەین، وەك:

ئێمە نووستوو (ین) (–)ەوە

ئێمە نووسراو (ین) (–)ەوە

ئێمە سوتێنراو (ین) (–)ەوە

ئـەوا، هـەموو کـوردیزانێکی پتـەو هەسـت دەکـات کـە لـە دیـواری ئـەو سـێ ڕسـتەیەدا کلۆرییەکی ڕێزمانی هەیە و دەبێت پڕبکرێتەوە بە روخساری تەواوی مۆرفیمی ئێستایی (ـەت).

## ٦:٥- ئەرکی ڕێزمانی:

لە بڕگەی پێشوودا، دەرخرا کە جێناوی ڕێژەی فەرمان دەگەڕێتەوە بۆ کەسی دوەمی تاك و بۆ ڕێژەی (رانەبردوو). بێ گومان، لە ئەو رووبەرەدا ئەو جێناوە هەر لە ئەرکی (بکەر)دایە، لە کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا، وەك:

تۆ بکەو (ە): تۆ بگر (ە)

لە بەرانبـەردا، مـۆرفیمی ئێستایی (ـە) لـە دوو ڕوو بـەردا دەردەکـەوێت و لـە هـەر ڕووبەرێکدا دەتوانێت لە جێگەی (بکەر) و جێگەی (بەرکار) دەربکەوێت، وەك:

ـ لەجێگەی (بکەر) لە رانەبردوودا، وەك:

ئەو هەیـــ (ـە)

ئەو ـــــ (ە)

ـ لەجێگەی (بەرکار) لە رانەبردوودا، وەك:

من هـــەم (ـە)

من گەرمام (ـە)

ـ لەجێگەی (بکەر) لە ڕابردوودا، وەك:

کۆترەکە فڕیو (ە)

نانەکە سووتاو (ە)

- ئەرکی (جێگرەوەی بکەر) لە ڕابردوودا، وەك:

هەواڵەکە گەیەنراو (ە)

نامەکە نووسراو (ە)

ـ لەجێگەی (بەرکار) لە ڕابردوودا، وەك:

من کۆترەکەم فڕاندو(ە)

من نامەکەم نووسیو (ە)

بە ئەم شێوەیە، سیمای یەکسانی دەر دەکەوێت بە ئەوەی کە هەردوو ڕەگەزەکە دەچنە جێگەی (بکەر)، یان سیمای جیاوازیی دەردەکەوێت کە تەنها مۆرفیمی ئێستایی دەتوانێت بچێتە جێگەی (بەرکار). ئەوەیش لەیاد نەکەین کە ئەرکی جێناوی ڕێژەی فەرمان ئەرکێکی ڕەسەن و بنەڕەتییە و ئەرکەکانی مۆرفیمی ئێستایی بریتییە لە (دەرکەوتن) لە جێی جێناوێکی (نادیار)، یان جێناوێکی لابردراو (بە ڕێزمان).

### ٧:٥- ئاوابوون لە ئاسۆی ڕستەدا:

ئەو دەنگە خپانەی کە لەنێو ئەو دوو مۆرفیمەدا هەن، لە ژینگەی ئاساییدا ئاوا دەبن، بەڵام تەنها بە زەبری بزوێن دەژێنەوە. سەرەرای ئەمە، هەردوو مۆرفیمەکە لە ژینگەی ئاساییدا دەتوانن ونبا ببن و بکەونە ژێر باری تەم و مژدارەوە، بەڵام بە دوو ڕێگای زۆر جیاواز، بە ئەم چەشنە:

**یەکەم: مۆرفیمی ئێستایی (ـە):**

مۆرفیمی ئێستایی هەموو کاتێك بە جمکی لەگەڵ ڕیزە جێناوی (م، یت، - ، ین، ن، ن) پەیدا دەبێت و لەهەمان کاتدا هەر بە ئەو ڕیزە جێناوە دادەپۆشرێت. کە واتە، مۆرفیمەکە بەگشتی داپۆشراوە و بەتایبەتیش بە چەند میکانیزمێك دەر دەکەوێتەوە، وەك:

(١): هەبوونی (جێناوێکی نادیار) لە ڕیزەکەدا: وەك جێناوی کەسی سێیەمی تاك: (ئەو نووستوە).

(٢): بە جێگیر کردنی ڕیزە جێناو (م، یت، -، ین، ن، ن) بە جێناوی جودا (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان)، لە ڕابردووی تەواودا و لە ڕۆڵی (بەرکار)دا. بۆ نموونە، لە ئەم ڕستەیەی خوارەوەدا، جێناوی بەرکار /ت/ جێگیرکراوە بە جێناوی جودا (تۆ) و مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە شێوەکی سەرسووڕهێنەر ماوەتەوە بە (سەرباقی).

من ناردوو م(یت): من تۆم ناردو(ـە)

(٣): بە سەپاندنی زەبری بزوێن: لە هەر جێیەکدا کە مۆرفیمەکە داپۆشرابێت، بۆ نموونە لە ئەم ڕستەیەی خوارەوەدا، سەپاندنی زەبری بزوێن دەبێت بەهۆی دۆزینەوەی دەنگە خپەکەی /ت/ و لە ئەنجامدا مۆرفیمەکە خۆیشی ئاشکرا دەبێت، وەك:

من نووسراوم: من نووسراوم (ـەت)ـەوە

**دوەم: جێناوی فەرمان (ـە):**

**جێناوی ڕێژەی فەرمان، جێناوێکی ئاشکرایە بە گشتی و هەموو کاتێك بە ڕەواڵەتی (ـە) دیار دەبێت. لە بەرانبەردا، هەندێك جار ئەو بزوێنە لەگەڵ بزوێنی دیدا ئاوێتە دەبێت و وندا دەبێت لە ریزەکەدا، وەك:**

**تۆ بڕۆ (-) : تۆ بی ڵێ (-)**

**لە رستەی یەکەمدا، بزوێنی /ـە/ ئاوێتە بوە لەگەڵ بزوێنی /ۆ/ و لە رستەی دوەمدا ئاوێتە بوە لەگەڵ بزوێنی /ێ/. لە ئەم جۆرە رستەیەدا، دەتوانین بیر بگوشین و بڵێین، (ئەدی دەنگە خپی /ر/ کوانێ ؟).**

**بەڵێ ئەگەر زەبری بزوێن بخەینە کار، دەتوانین کلکی جێناوەکە بدۆزینەوە، وەك: (تۆ بڕۆ ر موە) یان (تۆ بی ڵێ ـرەوە). تۆ بڵێیت هێشتا تەم و مژ مابێت لە ئاستی ئەو دوو رستەیەدا، کە لەلایەکەوە دەنگی خپ /ر/ هەیە لە جێناوەکەدا و لەلایەکی ترەوە، بزوێنی /ـە/ ئاوێتە بوە لەگەڵ بزوێنەکانی دی. کەواتە، مۆرفیمی ئێستایی بە شێوەی گشتی داپۆشراوە، بەڵام جێناوی ڕێژەی فەرمان بە شێوەیەکی گشتی ئاشکرایە، کەچی بزوێنەکەی ئاوێتە دەبێت لەگەڵ بزوێنی دی. زێدەباری، لە هەردوو ڕەگەزە ڕێزمانیەکەدا، دەنگی خپ هەیە و هەر (زەبری بزوێن) دەتوانێت بە سەنسەری دەنگسازی بیان دۆزێتەوە و بە زوومی ڕێزمانیش بیان خوێنێتەوە.**

## ٨:٥- بەرەنجام و لێکدانەوە:

هەرچەند زۆربەی بابەتەکانی نێو ئەم نووسینە، کەم و زۆر لە نووسینەکانی ئێمەدا باس کرابن، بەڵام لە بەراورددا زۆر وردە بابەت و بیرۆچکەی نوێ دەر دەکەون. لەگەڵ ئەوەیشدا، چەند خاڵێك دەبێت بە بەرەنجام و پێویست بە تۆمار کردن دەکات.

- لە ڕواڵەتدا، روخساری مۆرفیمی ئێستایی و جێناوی ڕێژەی فەرمان دەچنەوە سەر بزوێنی /ـە/. واتە، هەردوویان بە ئەو روخسارە ڕواڵەتییە دەردەکەون.
- کاتێك کە ژینگە ئاساییەکە تێك دەچێت و (زەبری بزوێن) دەچەسپێت، روخساری مۆرفیمی ئێستایی دەبێت بە ( ـەت) و روخساری جێناوی ڕێژەی فەرمانیش دەبێت بە (ـەر). واتە، لە هەریەکێکیاندا دەنگێکی ڕەسەنی خپکراو دەردەکەوێتەوە.
- ئەو دوو دەنگە خپە /ت/ و /ر/ چوار سیمای جودا کەرەوە هەڵ دەگرن، کە ناسنامەی (خپایەتی) خۆیان بپارێزن لە پاشخانی زێزمانەکەدا، وەك:

<u>یەکەم:</u> لابردنی ئەو دەنگانە دەبێت بەهۆی کلۆر بوونی جەستەی ڕستەکان بە دیاردەی (نارێزمانی).

<u>دوەم:</u> جێگیر کردنەوەی ئەو دوو دەنگە بە هەر دەنگێکی تر بۆ (ناوگرایەتی)، دەبێت بەهۆی دیاردەی نارێزمانی[٤٧].

<u>سێیەم:</u> ئاڵوگۆڕکردنی هەردوو دەنگەکە لەنێوان خۆیاندا هەر دەبێت بە (نارێزمان).

<u>چوارەم:</u> بەرانبەر بە ئەو خاڵانەی پێشەوە، دەرخستنی ئەو دوو دەنگە، بە گۆکردنیان لە ژینگەی ئاساییدا، هەر دەبێتەوە بە هۆی نارێزمانی و ناتەبایی.

---

[٤٧] هەر دەنگێکی (نەبزوێن) دەتوانێت کێشە دەنگسازییەکە چارەسەر بکات، بەڵام هەر دەنگە خپە ڕەسەنەکە پەسەندە لە ئەم کەمەیەدا.

- مۆرفیمی ئێستایی نە (کەس) و نە (ژمارەی کەس) هەڵ ناگرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ڕەگەزە (جێناو) نیە. لە بەرانبەردا، ڕەگەزی دوەم کەس و ژمارەی کەس هەڵدەگرێت، بەرانبەر بە کەسی دوەمی تاك.
- مۆرفیمی ئێستایی بە شێوەیەکی گشتی بە ریزە جێناوی (م، یت، -، ین، ن، ن) دادەپۆشرێت و لە باری تایبەتیدا بەلاچوونی جێناوەکان دەردەکەوێت. لە بەرانبەردا، جێناوی ڕێژەی فەرمان بە گشتی ئاشکرا و دیارە لە باری تایبەتیدا، لەگەڵ بزوێندا ئاوێتە دەبێت و ون دەبێت لە ریزەکەدا.
- جێناوی ڕێژەی فەرمان هەرچەند بە تەواوی ون ببێت لە ڕێزەکەدا، بەلاّم بە (زەبری بزوێن) کلکەکەی دەدۆزرێتەوە. لە بەرانبەردا، مۆرفیمی ئێستایی هەرچەند دابپۆشرێت بەلاّم (زەبری بزوێن) دەتوانێت بە ڕوخساری تەواوی (ـەت) ئاشکرای بکات.
- جێناوی ڕێژەی فەرمان لە ڕۆڵی (بکەر)دایە بە ڕاستەوخۆیی، بەلاّم مۆرفیمی ئێستایی لەجێی (بکەر) یان لەجێی (بەرکار) دادەنیشێت، ئەگەر جێناوە داپۆشەرەکە دیار نەبێت.
- جێناوی ڕێژەی فەرمان تەنها هەر لە ڕووبەری تایبەتی فەرمانی ڕاستەوخۆدا هەیە، کەچی مۆرفیمی ئێستایی لە هەردوو ڕووبەری ڕانەبردووی ئێستایی و ڕابردووی تەواودا هەیە.

بە ئەم چەشنە، هەموو خاڵەکانی یەکسانی و جیاوازی دەر دەکەون، لەنێوان ئەو دوو ڕەگەزە ڕێزمانیەدا. لەگەڵ ئەوەیشدا، بەراوردەکە دەرگای زۆر بابەت دەکاتەوە کە زۆر تازە و دەگمەنە لە ڕێزمانی کوردیدا. ئەو بابەتانەیش بریتین لە دەنگی خپ (silent)، ناسنامە و ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی، داپۆشینی مۆرفیمی ئێستایی، زەبری بزوێن ... تاد.

بەهیوای توانیێتمان کە خزمێکی بچووك پێشکەش بکەین بە ئەلبوومی ڕێزمانەکەمان.

## سەرچاوەکان


١. د. شێرکۆ بابان، دەنگی خپ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری "کاروان" ژمارە (١١٦)، هەولێر ١٩٩٧ (بەشی یەکەم لە ئەم کتێبە).

٢ـ د. شێرکۆ بابان، کتێبی "میکانیزمە بنەڕەتییەکان رستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون" هەولێر ١٩٩٧.

٣. د. ئەورەحمان حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، وشەسازی، جێناو، بەغدا ١٩٨٧.

٤. لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

٥. د. کوردستان موکریانی و د. نەسرین فەخری، ڕێزمانی کوردی، بۆ پۆلی یەکەم لەبەشی زمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٢.

٦. نوری عەلی ئەمین، ئەرك و شوێنی راناوە کەسییەکان لە ئاخاوتنی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٦.

٧. د. وریا عومەر ئەمین (لە یاسا دەنگیەکانی زمانی کوردی) گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) ژمارە (١٣٨) بەغدا ١٩٩٦.

# بەشی شەشەم

# دەنگی خپ و دەنگی نیمچەخپ لەزمانی نووسیندا[٤٨]

## ٦ : ١ ـ دەستپێك:

بەرانبەر بەزاراوەی (بزوێن؛ Vowel) زاراوەی (نیمچەبزوێن؛ Semi-vowel) هەیە، واتە ئەو فۆنیمەی کە بە مەرجی (خشان لە کلکی نەبزوێن) دیوی (بزوێن) پەسەند دەکات، ئەگەرنا وەك (نەبزوێن) رەفتار دەکات. بێگومان، جۆرە دەنگی ئاوها، دوودیون و بە ژینگەی دەنگسازی دەگۆڕێن. بۆ نموونە، دەنگی نیشانەی رابردوو /ی/، لە نموونەی (ئەو ناردی)دا، بریتیە لە (بزوێن)، چونکە سەری خشاوە لە کلکی نەبزوێنی /د/ و لە نموونەی (ئەو دەی نارد)دا، بریتیە لە (نەبزوێن)، چونکە سەری نە خشاوە لە کلکی (نەبزوێن). یان، دەنگی /وو/ لە وشەی (کەوتوو)دا بریتیە لە (بزوێن) و لە وشەی (وەستاو)دا بریتیە لە (نەبزوێن)[٤٩]. ئەمە و لەسەر کێش ئەندازەی (نیمچە بزوێن)، ئێمەیش دەتوانین زاراوەی (نیمچەخپ)، واتە (Semi-silent)، پێشنیار بکەین بۆ ئەو دەنگانەی کە ناتوانن لەسەر دیوێك بە جوانی بڕەخسێن لە گوفتاردا. بۆ نموونە، دەنگی /ت/[٥٠] لە جێناوی (ێت) و (یت)دا، چەند بارێك پسەند دەکات، وەك:

<u>یەکەم</u>: لە ئاخاوتندا، لەزۆر ناوچەدا گۆناکرێت، وەك:

**تۆ دەکەو (ی)؛ ئەو دەکەو (ێ)**

---

[٤٨] گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٠)، ساڵی ١٩٩٩.

[٤٩] دیاردەی (نیمچە بزوێناتی) گشتیە و لەزمانان هەیە و رێزمانەکەی ئاشکرایە بۆ هەموان. لە ئەم روەوە، ئێمەش بیرو بۆچوونی تازەمان هەیە، بەڵام لە ئێرەدا پێویست ناکات کە باسی بکەین، ئەو کەسەی مەبەستی بێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە؛ (خشتەی لێکدانی بزوێن)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٤)، ١٩٩٨

[٥٠] ئێمە لەهەموو جێیەکدا هاوار دەکەین کە دەبێت ئەو دوو جێناوە بە روخساری تەواوی (یت) و (ێت) رێنووس بکرێن لە زمانی نووسینی رێزمانداردا.

ئەم جۆرە ڕوخسارە ناتەواوە بەجوانی و بەبێ ڕێسا لە زمانی نووسیندا ڕاوێشکە دەکات. بۆ نموونە، هەندێك لە نووسەران و ڕێزماننووسان بەدەستی مەبەست بە ئەو چەشنە ڕیزی دەکەن لە نێو دێری نووسراودا[٥١]. یان، هەندێکی تر بەشێوەیەکی شاش و واش و بەبێ بنەما جارێك بەتەواوی دەینووسن و جارێکی تر بە ناتەواوی[٥٢].

دووەم: هەندێك لە نووسەران و ڕێزماننووسان خۆ جودا دەکەنەوە و بەبێ هاوێرکردن هەردوو جێناوەکە بە ڕوخساری تەواو ڕێنووس دەکەن، وەك[٥٣]:

تۆ دەکەو (یت)؛ ئەو دەکەو (ێت)

بێگومان، جۆرە (نووسین)ی ئاوها، سیمای (زمانی ڕێزماندار) هەڵ دەگرێت. لە ئاستی ئەو نموونانەدا، دەردەکەوێت کە دەنگی /ت/ لە ئەو جێناوەدا سیمای خپایەتی هەڵ دەگرێت و ئەو سیمایەیش دەتوانرێت بچەسپێنرێت، یان نەچەسپێنرێت.

لەلایەکی ترەوە، ئێمە هەر بەئەم دەنگە نیمچە خپەوە نەوەستاوین و گەیشتووین بە دەنگی خپ (Silent) وەك دەنگی /ت/ لە نێو مۆرفیمی ئێستاییدا. سەرەرای ئەمە، جارێکی تر و لە چینێکی قووڵتری زمانەکەدا بەهۆی ئەو دەنگەوە گەیشتووین بە (مۆرفیمی خپ) لە ڕیزی ڕێژەدا. بۆ نموونە، لە چەند ڕێژەیەکدا، وەك[٥٤]:

من نووسراو(م) ؛ تۆ نووسراو(یت)

[٥١] هەندێك لە ڕێزماننووسان ئەم کوێرەوەرییە دەگەیێنن بە زمانی نووسین و دەنگی /ت/ ڕێنووس ناکەن.

[٥٢] نووسەرانی ئێمە زۆربەیان خۆیان هیلاك ناکەن و بەزمانی نووسینەوە و هەر ڕاستەوخۆ بەزمانی ئاخاوتن دەنووسن. بەداخەوە، ڕێزمانی زمانەکە هێشتا وەك پێویست نە نووسراوەتەوە.

[٥٣] لە ئەم ڕووەوە، زمانی نووسین دەستی پیرۆزی ئەو نووسەرانە ماچ دەکات کە بەزەبری ڕێزمان دەقەکانیان دەنووسن. واتە (زمانی ئاخاوتن) لە (زمانی نووسین) جودا دەکەنەوە.

[٥٤] بابەتی (مۆرفیمی خپ) کراوە بەبابەتێك بەناوی (ڕێزمانەکەی خۆی، خۆی ڕاست دەکاتەوە)، گۆڤاری (نووسەری نوێ) ژمارە (٩)، ١٩٩٩. (بڕوانە بۆ بەشی سێیەم لە ئەم کتێبەی بەردەست).

زەبری بزوێن دەتوانێت بگات بە دەنگی خپی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا (ـە)، کە ئەویش لەژێر هەردوو جێناوی (م) و (یت) حەشاردراوە، وەك دەگوترێت:

من نووسراوم (ـەت)ەوە: تۆ نووسراویت (ـەت)ەوە

لە ئەم ڕستەیەدا، دەردەکەوێت کە دەنگی (نیمچە خپ) و (دەنگی خپ) و مۆرفیمی (خپ)یش هەیە. بێگومان، جۆرە بابەتی ئاوها خزمەتی زمانەکە دەکات و ئەو دەرگایانە دەکاتەوە کە بۆ زمانی نووسین پێویستن. لە ڕاستیدا، سەرپاکی ئەو دیاردانەی کە لە نێو ئەم نووسینەدا ریز دەکرێن، بە سایە و بە چاکەی (میکانیزمی زەبری بزوێن) یەکلایی دەکرێنەوە[55]. هەر لەبەر ئەوە، لەسەرەتادا، پوختەیەك لەسەر ئەو بابەتە باس دەکەین، بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز بە ئاسانی و بەرەوانی لەبابەتەکە تێ بگات.

## ٦ : ٢- زەبری بزوێن:

بێگومان یەکەم دەردووی ئاخاوتن بریتییە لە (بڕگە) و لەنێو جۆرەکانی بڕگەیشدا بڕگەیەکی سووکی ئاسایی لەچەشنی (CVo) بریتیە لە بچوکترین یەکەی گۆکراو (بە کۆ ئەندامی ئاخاوتن). ئەم جۆرە بڕگەیە دەبێت بە (بنچینە) بۆ پەیداکردنی چەند جۆرە بڕگەیەکی تر کە لە ئێرەدا پێویست ناکات باسیان بکەین. لە نموونەیبەکدا وەك (دا: CVo)، نهێنیەك هەیە و ئەویش ئەومیە کە (لکان)ێکی پتەو هەیە لەنێوان سەری بزوێنی /ا/ و کلکی نەبزوێنی /د/ و ئەو لکانەیش دەبێت بەهۆی پەیدابوونی دەنگێکی سێیەم (گرێی جووتەدەنگ)، کە:

---

[55] بابەتی (میکانیزمی زەبری بزوێن) کراوە بەنووسینێکی سەربەخۆ (بەشی چوارەم لە ئەم کتێبەی بەردەست).

**(١): لە ڕووی دەنگسازییەوە، پسوولەی گۆکردنی هەیە، ئەو گرێیەیش دەبێت بەهۆی زیاندنی جۆرەکانی بڕگە و بڕگەیش دەبێت بە هۆی ڕیزبوونی کۆلکەکانی ڕستە لە سەر زار.**

**(٢): لە ڕووی لۆجیکیەوە، دەتوانێت ببێت بە (کوانوو)یەکی پتەو بۆ ئەوەی واتایەك قەتیس بکات لە سەر فۆرمێك.**

**کەواتە، گرێی (جووتە دەنگ) هەردوو فۆرمی فۆنەتیکی و واتایی دابین دەکات. بە ئەم پێیە ئەو (لکان)ە بریتیە لە خۆشەویستییەك، یان لە ئارەزوویەکی ڕەمەکی لەنێوان (بزوێن) و ( نەبزوێن)دا، یان بەشێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین، بریتیە لە ئەو مگێزەی لە ناخی دەنگی (بزوێن)دا هەیە بۆ دەنگی (نەبزوێن)، بۆ دروست کردنی دەنگێکی سێیەم کە بە (جووتەدەنگ) ناسراوە. ئەمەیش لە بەر ئەوەی (بزوێن) خۆی خاوەن سەروەرییە لە چێوەی بڕگەدا، بەڵام لە تەرازووی زماندا لاسەنگە و ناساغە. لە ڕاستیدا، ژمارەی نەبزوێنەکان یەکسان نیە بە ژمارەی بڕگەکان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بڕگە دەتوانێت زیاتر لە یەك (نەبزوێن) هەڵ بگرێت، بەڵام ئەگەر بزوێنێك کرا بەسەربار، ئەوا دەبێت چێوەی بڕگەیەکی تر داگیر بکات. سەبارەت بە کەڵکی ئەم دیاردەیە، وەك دەزانین (بزوێن) زەبری هەیە و بزوێنی ڕووت بە هەموو نرخێك بۆ نەبزوێنێك دەگەڕێت؛ ئەو ڕەگەزە ڕێزمانیانەی کە بە (بزوێن) دەست پێ دەکەن، دەتوانن ئەو دەنگە نەبزوێنانە بدۆزنەوە کە بە ڕەوتی ڕۆژگار(خپ) کراون. یان (نیمچەخپ) کراون، یان لە نێو مۆرفیمێکدان کە مەکینە سناتاکسیەکە خپی کردوە. لە بڕگەکانی داهاتوودا، ئەو زەبرە دەخەینە کار و لە نێو چەندین نموونەدا بۆ دیاردەی (خپایەتی) و (نیمچە خپایەتی) دەگەڕێین.**

## ٦ : ٣ـ دەنگی خپ:

لە نووسینێکی تایبەتیدا، بە ناوی (دەنگی خپ لەزمانی کوردیدا/ بابەتی یەکەم لە ئەم کتێبەدا)، ئەوەمان بڵاو کردوەتەوە کە دوو دەنگی خپ هەیە لە دوو ڕەگەزی ڕێزمانیدا، وەك:

یەکەم: دەنگی خپی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دا.

دوەم: دەنگی خپی /ر/ لە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە)دا.

بەپێی ئەوەی لەسەرەوە گوترا، دەبێت روخساری ڕەسەن و پتەوی مۆرفیمی ئێستایی لەناخی بیرەمۆدا بریتیبێت لە (ـەت) و روخساری جێناوی ڕێژەیی فەرمان بریتیبێت لە (ـەر). لە ڕاستیدا، ناونانی ئەو دوو دەنگە لە ئەوەوە هاتوە کە بەتەواوی خپن و هەر بە زەبری بزوێن دەردەکەون. کەواتە، دەرکەوتنی ئەو دوو دەنگە بەبێ زەبری بزوێن دەبێت بە هۆی دیاردەی (نارێزمانی)، وەك:

من ئەم ناردوو(ـە): من ئەم ناردوو(ـەت)*

تۆ بخەو (ە): تۆ بخەوە (ەر)

لەبەرانبەردا، ئەگەر زەبری بزوێن چەسپا، ئەوا دەبێت ئەو دوو دەنگە هەبن، وەك:

من ئەم ناردوو (ـەتـ)ـەوە: تۆ بخەو (ـەر)ەوە

لە ئەم ئاستەدا، ئەگەر زەبری بزوێن لە ئارادابوو و زۆر کرا کە ئەو دوو دەنگە خپە دەرنەکەون، ئەوا جارێکی تر دەگەینەوە بە (نارێزمان)، چونکە هیچ ناوگرێکی تر لە ئەوێدا بۆی نیە دەربکەوێت، وەك:

من ئەم ناردوو (ـە ـ)ەوە: تۆ بخەو (ـە ـ)ەوە

بەڵێ، بە ئەمەدا دەردەکەوێت کە دەنگی خپ دوو باری هەیە، وەك:

یەکەم: باری خپبوون و دەرنەکەوتن بەبێ زەبری بزوێن. واتە، دەرخستنی لە ئاخاوتندا دەبێتە هۆی (ناڕێزمان).

دووەم: باری دەرکەوتن بە زەبری بزوێن. واتە، دەرنەخستنی لە ئاخاوتندا دەبێتە هۆی (ناڕێزمان).

ئەمەش خۆی لەخۆیدا واتای ئەوە دەبەخشێت کە ئەو دوو دەنگە بە تەواوی خپن و تەنها و تەنها هەر بە (میکانیزمی زەبری بزوێن) بۆیان هەیە دەربکەون لە ریزی گوفتاردا.

## ٦:٤ ـ دەنگی خپ لە مۆرفیمی خپدا:

لە هەموو ئەو نووسینانەدا کە لە سەر ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستاییدا بڵاومان کردووەتەوە، ئەوەمان دەرخستوە کە مۆرفیمی ئێستایی لە ڕانەبردووی کاری (بوون و هەبوون) و لە ڕووبەری (ڕابردووی تەواو)دا هەیە و لە ئەو دوو جێیەیشدا، دەبێت بە مۆرفیمێکی خپ لە ژێر جێناوەکانی سێتی یەکەمدا. لەلایەکی ترەوەوە، دەتوانین بڵێین: لە ئەو دوو ڕووبەرەدا، لە ژێر هەر جێناوێکدا، لەچەشنی (م، یت، ـ، ین، ن، ن)، مۆرفیمەکە هەیە و دەرکەوتنی لە کەسیی سێیەمی تاکدا دەگەڕێتەوە بۆ نادیاری جێناوەکەی. بۆ نموونە، لەژێر جێناوی بکەری ئەم پێنج ڕستەیەدا هەیە و بەزەبری بزوێن دەردەکەوێت:

**من کەوتووم ؛ من کەوتووم (ـەت)ەوە**

**تۆ کەوتوویت ؛ تۆ کەوتوویت (ـەت)ەوە**

**ئێمە کەوتووین ؛ ئێمە کەوتووین (ـەت)ەوە**

**ئێوە کەوتوون ؛ ئێوە کەوتوون (ـەت)ەوە**

**ئێوە کەوتوون ؛ ئێوە کەوتوون (ـەت)ەوە**

بە سەرنجێکی ورد، لە نموونەکانی دەستەی یەکەمدا دەردەکەوێت کە مۆرفیمەکە دیار نیە و مەگەر بە زۆر دەری بخەین، وەك:

**من کەوتووم (ـە)؛ تۆ کەوتوویت (ـە)**

**ئێمە کەوتوین (ـە)؛ ئێوە کەوتوون (ـە)**

لە باری ئاساییدا، ئەو مۆرفیمە دەرناکەوێت و ئەگەر دەرکەوت، ئەوا زەبری بزوێنێك گەیشتوە بە کلکی دەنگی خپ /ت/ و رای کێشاوەتە سەر زار. بۆ نموونە، لە نموونەی (ئێمە نووسراوینەوە)دا لاسارییەك هەیە، چونکە زەبری بزوێن هەیە و نەمان هێشتوە بگات بە کلکی مۆرفیمەکە. واتە، لە ئەو رستانەدا نارێزمانییەك رووی کردوە لە (زمانی نووسین)، هەر لەبەر ئەوە، ناشێت و نابێت بهێڵین کە زمانەکە بەجۆرە بابەتی هەرەمەکی و بێ رێزمان لەکەدار بێت. لە ئەم رووەوە، سەرنجێکی ورد دەری دەخات، کە وەك مۆرفیمی ئێستایی حەشاردراوە لە ژێر جێناوەکاندا، دەتوانرێت بەزۆر گۆی بکەین، وەك:

**ئێمە کەوتووین ← ئێمە کەوتووینە**

**ئێوە کەوتوون ← ئێوە کەوتوونە**

لە ئەم نموونانەدا و لە ئەو نموونانەی پێشتردا، وا دەر دەکەوێت کە گۆکردنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەبێت بە (نائاسایی)، بەڵام نابێت بە (نارێزمان)، چونکە تێکەڵ نابێت واتایەکی تر. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا بریتیە لە سەلمێنەرێکی کاریگەر بۆ هەبوونی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لەژێر جێناوەکاندا. لەئاستی ئەم کێشەیەدا، وا دەردەکەوێت کە سەرچاوەیەك پەیدا بوو بێت بۆ پەرپووت کردنی (زمانی نووسین) بە باری (هەرەمەکێتی) لە ڕێزمانی ئەو مۆرفیمە خپەدا. لەلایەنی ئێمەوە، ئێمە بە ئەم چەشنە ڕێزمانەکە یەکلایی دەکەینەوە:

یەکەم: مۆرفیمی (ـە) هەموو کات خپە لەژێر جێناودا و دەرناکەوێت، مەگەر لەکەسی سێیەمی تاکدا، لە بەر ئەوەی جێناوەکە نادیارە. بێگومان، ئەم خاڵە هەر ڕانەبردووی کاری (بوون و هەبوون) و ڕابردووی تەواو دەگرێتەوە.

دوەم: لە هەر نموونەیەکی ڕابردووی تەواودا، ئەگەر ڕێزمانەکە ڕێ بدات کە سێتە جێناوی (م، یت، —، ین، ن، ن) بکرێت بە جێناوی جودا، ئەوا مۆرفیمی (ـە) بە یەکسانی بۆ هەر شەش کەسە ڕێزمانیەکە دەر دەکەوێتەوە. ئەم دەرفەتە هەر (بەرکار)ی ڕابردووی تەواو دەگرێتەوە.

سێیەم: لەهەر جێیەکدا کە مۆرفیمەکە بەزۆر دەر بخرێت، واتە لەژێر (زەبری بوزێن)دا نەبێت، ئەوا (لاساری) ڕووی دەدات.

چوارەم: بەرانبەر بە خاڵی دوەم، ئەگەر لەجێیەکدا (زەبری بزوێن) هەبێت و مۆرفیمەکە دەر نەکەوتبێت، ئەوا جارێکی تر (لاساری) بەرپا دەکرێت.

پێنجەم: لەبەر ڕووناکی خاڵەکانی پێشوو، لە هەر جێیەکدا کە مۆرفیمەکە دەرهێنرابێت لە ژێر جێناوەکە و لە خپی ڕزگار کرابێت، دەبێت زەبری بزوێن چەسپابێت. بێگومان

(زەبری بزوێن) دەگات بە دەنگە خپەکەی نێو مۆرفیمەکە، نەك بە مۆرفیمەکە خۆی، هەر لەبەر ئەوە دەبێت بە روخساری تەواوی (ـەت) دەربکەوێت لە ریزەکەدا.

## ٦ : ٥ ـ دەنگی نیمچەخپ:

وەك لەپێشەکی ئەم نووسینەدا باسکرا، دەنگی /ت/ لە هەر دوو جێناوی (یت) و (ێت)دا کەوتوەتە بەر رەشەبای پەرپووتی[٥٦]. هەندێك لە ڕێزماننووسان داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەو دەنگە هەر نیە لە ئارادا و هەندێکی تر بەرچاویان دەبێت بە تەم و دەڵێن: جێناوی (ێت) هەر نییە لەریزەکەدا. بێگومان ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەدا نین و ئێمە چێوەی ئەو دوو جێناوە بە برگەی پڕی ناتەواو (QVc) دەناسین، وەك: (ێت|QVc یان: یت|QVc). لە ئەم ئاستەدا، ئێمە باری چێوەی ئەم دوو جێناوە لە جێناوی (ین|QVc) جودا ناکەینەوە، کە تێیدا دەنگی (ن) ناکەوێتە بە پەرپووتی. ئێستایش، دەتوانین چەند سەرنجێك تۆماربکەین دەربارەی ئەم کێشەیە:

یەکەم: هەندێك کەس دەنگی /ت/ ڕێنووس ناکەن، وەك:

ئەو دەکەو (ێت) ـــــ ئەو دەکەو(ێ)

تۆ دەکەو (یت) ـــــ تۆ دەکەو (ی)

دووەم: زۆر جار بەبێ بایەخی و بەبێ منەتی لە نووسینی نووسەرێکدا، هەردووباری (نووسین) و (نەنووسین)ی دەنگی /ت/ دەردەکەوێت.

---

[٥٦] جێناوی (ت) لە سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) هەمان پەرپووتی بە سەردا هاتوە لە ئاخاتندا، بەلأم کێشەکە ناتوانێت بگات بە زمانی نووسین، چونکە ڕێنووسەکە رێ نادات.

سێیەم: بەرانبەر بە (زەبری بزوێن)، هەمووماں یەك دەگرین و هەر هەمووماں دەنگی /ت/ ڕێنووس دەکەین.

چوارەم: هەندێك لە نووسەران، لە کەسی دووەمی تاکدا زۆر دەکەن لە ڕێژەکە و دەنگی /ت/ ڕێنووس ناکەن، وەك: {تۆ دەنووس (یت)ەوە؛ تۆ دەنووسی (ی)ەوە}. لەبەرانبەردا، ناتوانن ئەو کردەوەیە بچەسپێنن بەسەر جێناوی (ێت)دا چونکە دەچێتە سەر بارێکی تر و لێڵی پەیدا دەبێت.

سەبارەت بە (نیمچەخپایەتی) لە دەنگی /ت/دا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

یەکەم: دەنگی نیمچەخپ جارێك دەنووسرێت و جارێك نانووسرێت. ئەوەش نابێت بە ناهەمواری، هەر لەبەر ئەوە سیمای (نیمچەخپایەتی) بەدی دەکرێت.

دووەم: ئەگەر بڵێین دەنگی (خپ) لەباری ئاساییدا بەتەواوی دەرنەکەوێت و لەبەر (زەبری بزوێن) بەتەواوی دەربکەوێت، ئەوا جارێکی تر دوو دیوی هەیە لە هەڵوێستەکەدا و سیمای (نیمچە خپایەتی) دەردەکەوێت.

سێیەم: ئەگەر بڵێین، لە ئاستی (زمانی نووسین)دا بنووسرێت و لەئاستی (ئاخاوتن) و (خوێندنەوە)دا گۆ نەکرێت، هەر باری دوو دیوی دەردەکەوێت.

چوارەم: ئەگەر زەبری بزوێنێك پەیدابوو، ئەوا چی لەئاستی (نووسین) و چی لە ئاستی (خوێندنەوە)دا، هاوئاهەنگی دەردەکەوێت و دەنگی /ت/ دەبێت بەکاری ناچار. بە کۆی گشتی، ڕێنووسکردنی ئەو دەنگانەی کە نیمچەخپن، باری (زمانی نووسین) ڕاست دەکاتەوە و دەی بات بەرەو زمانێکی (ڕێزماندار).

## ٤ : ٦ ـ گفت و گۆ و لێکدانەوە:

لە ئەم بەشەدا ڕوو دەکەین لەچەند تەوەرێك و پێداچوونەوەیەك ئەنجام دەدەین. بە ئەو هیوایەی کە کەڵك و بەرئەنجامی ئەم نووسینە بچنینەوە:

**یەکەم تەوەر: دەنگی (خپ) و دەنگی (نیمچە خپ):**

لەرووی جیاوازییەوە، دەنگی (خپ) ئەگەر بەبێ هۆ گۆ بکرێت، لاسارییەکی ڕێزمانی پەیدا دەبێت، بەڵام دەنگی (نیمچەخپ) ئەگەر گۆ بکرێت و ڕێنووس بکرێت باری ڕێزمانی ڕێژەکە ڕاست دەبێتەوە و ڕێژەی لاکۆڵان و ڕێژەی زمانی نووسین لەیەکتر جودا دەبنەوە. بۆ نموونە، تشتێکی زۆر ڕێزمانی و جوانە ئەگەر ڕێژەی (دەکەوێ) بە (دەکەوێت) ڕێنووس بکرێت، یان گۆ بکرێت، بەڵام نامۆیی پەیدا دەبێت ئەگەر دەنگی خپی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا گۆبکرێت، یان ڕێنووس بکرێت، وەك (کەوتوە: کەوتومت). کەواتە، دنگی (نیمچەخپ) بەبێ زەبری بزوێن و لەگەڵ زەبری بزوێن دەتوانرێت گۆ بکرێت، یان بنووسرێت، بەڵام دەنگی (خپ) تەنها و تەنها لەگەڵ زەبری بزوێندا دەتوانرێت گۆ بکرێت، یان بنووسرێت.

**دووەم تەوەر: بەرەو زمانی نووسین:**

سەبارەت بەزمانی نووسین، چەند بۆچوونێك هەیە، وەك:

<u>یەکەم</u>: ڕێنووس کردنی دەنگی (نیمچەخپ) لە ڕوخساری هەردوو جێناوی (یت) و (ێت)دا، لەسەر ئەندازەی جێناوی (ین)، دەبێت بە هۆی یەکخستنی زمانی نووسین و یەکخستنی زاری ناوچەیی لە ئاستی نووسیندا. هەر لەبەر ئەوە، ئێمە داوا دەکەین کە دەبێت دەنگی /ت/ بنووسرێت لە زمانی نووسیندا.

دووەم: سەبارەت بە دەنگی خپ، لە بەر ئەوەی لەئاخاوتندا تەنها هەر بە بزوێنەوە گۆ دەکرێت. دەشێت هەر لەگەڵ زەبری بزوێندا ڕێنووس بکرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، زۆرکردن لە ڕێژە و ڕێنووس نەکردنی دەنگی خپ لەریزەکەدا، دەبێت بە هۆی لاسارییەکی گەورە و لادان لە ڕێزمان.

سێیەم: ئەوەی لەسەرەوە باس کراوە، لە ڕێزمانی دێریندا بەرێزمانی زمانانی تر پینە کراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بە ڕێزمانی کوردی نووسەرانمان بتوانن ڕێژەی سواو و ڕێژەی ڕێزمانی لەیەکتری جودا بکەنەوە.

سێیەم تەوەر: مۆرفیمی ئێستایی نادیار:

لەر ێزمانی نووسراودا، (مۆرفیمی نادیار) هەیە، وەك جێناوی کەسی سێیەمی تاك لە ڕێژەی (کەوت)دا، بەڵام (مۆرفیمی خپ)یش هەیە، لە ڕێژەیەکدا وەك (مـن کەوتووم). لە ئەم ڕستەیەدا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لەژێر جێناوی (م)دا خپ بوە، وەك دەنگێك، بەڵام خۆی لەخۆیدا بریتیە لە مۆرفیمێك (مۆرفیمی ئێستایی). ئەمەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (مۆرفیمی خپ)یش هەیە. ئەمە و ئەو مۆرفیمە دووجار کەوتوەتە بەر خپبوون. یەکەم جار دەنگی /ت/ لە روخسارەکەی خودی خۆیدا خپبوە و روخسارەکەی لە (ـەت)ەوە بوە بە (ـە ـ). پاشان، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) خپ بوە و بە تەواوی چوەتە ژێر جێناوی (م). واتە، لەژێر سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن)دایە. کەواتە، مۆرفیمەکە خپبوە، بەڵام دەرکەوتنی لە ئەوەدایە کە (زەبری بزوێن) دەگات بە دەنگە خپەکەی /ت/ و لە گۆکردندا زیندووی دەکاتەوە. لە ئەنجامدا بە روخساری تەواوی (ـەت) دەبووژێتەوە. لە ئەم ئاستەدا، دەتوانین بڵێین: زەبری بزوێنەکە دەنگی /ت/ رادەکێشێت و دەنگی /ت/ نیوەکەی تری (ـە) رادەکێشێت، چونکە هەردوو دەنگەکە

بریتین لە پێکهاتەی یەك مۆرفیم. ئەمە و سەبارەت بە گرفتەکانی دەنگی (نیمچەخپ) چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

یەکەم: لەنموونەیەکدا وەك (کەوتووی)، لەلایەکەوە جێناوی (یت) بە (ی) گۆکراوە لەلایەکی ترەوە مۆرفیمی (ـە) لەژێر جێناوەکە خپ بووە.

دوەم: کاتێك کە بزوێنی بەرایی لە ڕەگەزی (ەوە)دا دەخشێت لە کلکی ڕستەی (کەوتووی) چەند بارێکی شیاو پەیدا دەبێت:

(١): کەوتوو یـ(ـەوە)، (٢):کەوتوویتـ(ـەوە)، (٣): کەوتوویتـ(ـەت) ەوە

لەنموونەی یەکەمدا زەبری بزوێنی /ـە/ لەئارادایە، کەچی دەنگە نیمچەخپەکەی جێناوی (ێت) گۆنەکراوە. واتە، هەر بە (ی) گۆ کراوە، لە نموونەی دوەمدا، دەنگی نیمچەخپی /ت/ گۆکراوە، بەلاّم زۆر کراوە لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) کە دەرنەکەوێت. واتە، ڕێژەکە ڕابردووی تەواوە و مۆرفیمەکە هەیە و زەبری بزوێنی لە سەرە، بەلاّم بە زۆر خپکراوە. لە نموونەی سێیەمدا، نەجێناوی (یت) بە (ی) گۆکراوە و نە مۆرفیمی خپی (ـە) بێ بایەخکراوە. لە ئەم نموونەیەدا، (ڕێژەیەکی ڕێزماندار) پێشکەش کراوە، چونکە بزوێنی (ـە)ی پاشگری (ەوە) دەنگی خپی /ت/ی ڕاکێشاوە و برگەی (تـە) دروست کردوە. پاشان دەنگی /ت/ وەك ڕاکێشراوە بزوێنی (ـە)ی ڕاکێشاوە لە گەڵ خۆیدا و بزوێنی (ـە)یش دەنگی نیمچەخپی /ت/ ڕاکێشاوە لەجێناوی (یت)دا و برگەیەکی تر لە چەشنی (تـە) پەیدابوە و ریزمکە بوو بە:

<table>
<tr><th>دابەشبوونی ڕێزمانی</th><th>دابەشبوونی دەنگسازی</th></tr>
<tr><td>کەوتوو|یتـ|ـەت|ـەوە</td><td>کەوتوویـ|تـە|تـە|وە</td></tr>
</table>

لە ئەم نموونەیەدا، سنووری مۆرفیمە ڕێزمانییەکان (لای ڕاست) و سنووری بڕگەکان (لای چەپ) دیاریکراون. بەسەرنجێکی ورد دەردەکەوێت کە جێناوی (یت) و مۆرفیمی ئێستایی (ەت)، هەر یەکێکیان بەسەر دوو بڕگەدا دابەش کراون، تابتوانن بە زاردا تێبپەڕن. کەواتە، چیکەنە سینتاکسیەکە بە جۆرێك دەگەڕێت و چیکەنە دەنگسازییەکە بە جۆرێکی تر و بە دابەشکردنێکی تر، کە تێیدا زەبری بزوێن فەرمانڕەوایە و ماق سنوور بەزاندنی هەیە لە ریزبەندی مۆرفیمەکاندا.

## چوارەم تەوەر: دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ە)[٥٧]:

ئێمە لەهەموو نووسینێکدا ئەوە دووپات دەکەینەوە کە لە رووبەری (ڕانەبردووی ئێستایی) و لە رووبەری (ڕانەبردووی تەواو)دا، مۆرفیمەکە بە داپۆشراوی هەیە. لە ئەم روە، چەند میکانیزمێك هەیە کە بتوانێت رزگاری بکات لە داپۆشراوی. لە خاڵەکانی خوارەوەدا، پانۆرامەیەك بۆ سێ میکانیزم پێشان دەدەین کە دەتوانن لە ڕێزمانی کوردیدا بڕەخسێن بۆ دەرخستنەوەی مۆرفیمی ئێستایی. لە ئەوێدا، جێناوەکە شوبهێنراوە بە خشتێك و مۆرفیمەکەیش لە ژێریدا حەشار دراوە.

یەکەم: باری ئاسایی: مۆرفیمەکە لەژێر خشتی جێناوەکەدا (م) داپۆشراوە، وەك: (من نووسراوم)

دوەم: باری دەرکەوتن:

(١): لە میکانیزمی یەکەمدا، جێناوەکەی کەسی سێیەمی تاك نادیارە و روونە و مۆرفیمەکە لە ژێر شووشەکەدا دیارە و دەرکەوتوە، وەك: (ئەو نووسراوە).

---

٥٧ لەساڵی (١٩٩٨)دا، نزیکەی (٢٠) لێکۆڵینەوەمان بڵاو کردوەتەوە و لە زۆربەی ئەو نووسینانەدا، ئەو مۆرفیمە کەوتوەتە بەر زوومی لێکۆڵینەوە.

(٢): لە میکانیزمی دووەمدا، جێناوی (م) ئەگەر لە ئەرکی (بەرکار)دا بێت دەتوانرێت بەڕێزمان لابردرێت و بکرێت بە جێناوی جودای (من)، تا مۆرفیمەکە دەربکەوێت، وەك: (ئێوە نووسیوتانە): کە دەبێت بە (ئێوە منتان نووسیوە)

(٣): لە میکانیزمی سێیەمدا، ئەگەر هێزی موگناتیزی (بزوێن) بخەینە کار، دەتوانین مۆرفیمەکە بەسایەی دەنگە خپەکەیەوە دەربکەین لەژێر جێناوی (م) و دەری بخەینەوە لەریزەکەدا، وەك: (من نووسراومەتەوە).

**پێنجەم: بەرئەنجامەکان:**

- دەنگی /ت/ لە جێناوی (یت) و (ێت)دا لە نیمچەخپ دەچێت و بە ئەوە یەکلایی دەکرێتەوە کە لە ئاستی (زمانی نووسین)دا ئەو دوو جێناوە بە ڕوخساری تەواو ڕێنووس بکرێن.
- دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا بریتیە لە دەنگێکی (خپ) بە تەواوی و دەبێت هەر بە (زەبری بزوێن) دەربکەوێتەوە.
- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) وەك بریتیە لە مۆرفیمێکی خپ، لە ژێر سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن)دا دا دەپۆشرێت.
- نابێت لە ئاستی (زەبری بزوێن)دا زۆر بکرێت لە دەنگێك، یان لە مۆرفیمێك، کە گۆ نەکرێت، چونکە ئەوکردەوەیە لادانە لە زمانی ڕێزماندار.
- ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی زۆر زۆر بێ خزمەتە. دەرکەوتنی ئەم ڕەگەزە خپە بە چەند میکانیزمێك دەبێت، کە لە ئەم کتێبەدا چەندبارە کراونەتەوە. ئەو میکانیزمانەیش بریتین لە کەلێنی (جێناوی نادیار) و (لابردنی جێناوی لکاو)ی داپۆشەر و چەسپاندنی (زەبری بزوێن).

**سەرچاوەکان:**

١- د. شێرکۆ بابان، دینامیزی جێناوی لکاو لەرستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧.

٢- د. شێرکۆ بابان، میکانیزمە بنەڕەتیەکانی رستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون، هەولێر ١٩٩٧.

٣- د. رەحمان ئیسماعیل حەسەن، بڕگە و ئاسانی بوونی بڕگە لە کوردیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩١.

٤- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەشی دوەم، جێناو، بەغدا ١٩٨٧.

٥- مەسعوود محەمەد، حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

٦- د. تالیب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆژی بڕگە و ئاسانبوونی فۆنیمەکان لە زاری سلێمانیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩٩.

7- Leon, Exercise systematique de prononciation francaise, HACHETTE - LAROUSSE, Paris 1982.

# بەشی هەفتەم

## لە ئەلبوومی نیمچەبزوێندا[58]

**١:٧- سەرەتایەک:**

کاتێک کە ئێمە ئەلبوومی ڕێزمانی نیمچەبزوێن دەگەینەوە، دەبینین هێشتا زۆر ماوە کە بگوترێت، یان تۆمار بکرێت. لە راستیدا، نیمچەبزوێن زۆر زۆر لە ئەوە گەورەترە کە باسکراوە و کە باس دەکرێت، چی لە ڕێزمانی کوردیدا و چی لە ڕێزمانی زمانانی تردا. لە ئەم روەوە، هیچ جیاوازییەک بەدی ناکرێت لە نێوان ئەو بابەتە زانستیانەدا کە دەربارەی ئەم جۆرە دەنگە نووسراوە. واتە، بابەتەکان هەر وەک خۆیان و بەبێ دەسکارییەکی ئەوتۆ لە زمانێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ زمانێکی تر و لە نووسینێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نووسێنێکی تر. لەلایەکی ترەوە، مامۆستای بەڕێز مەسعوود محەممەد هەستی بە زۆر چشت کردوە و بە زیرەکی خۆی گەیشتوەتە زۆر بابەت، بەلام یەکلایی نەکردوونەتەوە. بە ئەم چەشنە، دەبینین کە ئەلبوومی (نیمچە بزوێن) هێشتا زۆر بێخزمەتە، چی لە پۆلێنکردندا و چی لە ئەو رەفتارانەدا کە دەی نوێنێت لە لێکخشانی دەنگەکانی زماندا. هەر لەبەر ئەوە، چەند خالێک دەخەینە ڕوو کە: ئەگەر لە پێشتردا هەستیان پێ کرابێت، بەلام وەک پێویست نەخراونەتە نێو چوارچێوە، یان نەکراون بە بابەتی ڕێزمانی. بێگومان جۆرە بابەتی ئاوها، لەوانەیە نەختێک نامۆبێت لە بەرچاو، چونکە سنووری لاسایی کردنەوە دەبەزێنێت و دەرگای گفتوگۆ دەکاتەوە لە نێوان توێژەرە زرنگ و بلیمەتەکاندا. بە هیواین، لە ئەم نووسینەدا بتوانین مەبەستەکە بپێکین و

[58] گۆڤاری (بەیڤ)، ژمارە (١١٢)، سالی ١٩٩٩، لاپەڕە (٦-١١)

بتوانین بیرو بۆچوونێکی ناسك و هورد بخەینە بەرچاوی بیری پسپۆران و بڵێین: دوو دەنگی زمان هەن، هەر کاتێك کە (سەر)یان بخشێت لە کلکی (نەبزوێن)، دەبن بە (بزوێن)، ئەگەرنا لە هەر لێکخشانێکی تردا بە (نەبزوێن)ی دەمێننەوە. لە ئیشەکانی ئێمەدا، ئەو دوو دەنگە ناوزەدکراون بە (نیمچەبزوێن)، یان بە (خلیسکەبزوێن). بۆ زانینی ئێوە، بە درێژایی ئەو شازدە ساڵەی کە بەسەر ئەم بابەتەدا هاتوە (١٩٩٩-٢٠١٥)، بیر و بۆچوونەکان پەرەیان سەندوە و نەختێك گۆڕاون. خوێنەر و توێژەر دەبێت ڕەچاوی ئەو گۆڕانکارییانە بکەن.

### ٢:٧- پۆلێنکردنی نیمچەبزوێن:

لە پۆلین کردنی دەنگەکانی زماندا، پەنا دەبردرێت بۆ پۆلی (نەبزوێن) لە چەشنی (ب. د. ت. ک. م، ... هتد)، بۆ پۆلی (بزوێن)یش پەنا دەبریت بۆ (أ، وو، و، ی، ۆ، ێ، ... هتد). لە ئەم کردەوەیەدا، دەنگی /ی/ لە وشەیەکدا وەك (یاد) دەبێت لەگەڵ (نەبزوێن)دا ڕیز بکرێت. لە بەرانبەردا دەنگی/ی/ لە وشەیەکدا وەك (بیر) دەبێت لەگەڵ (بزوێن)دا ڕیز بکرێت. ئەمەیش وا دەکات کە پەنا ببردرێت بۆ زاراوەی (نیمچە بزوێن)، بۆ ئەوەی بڵێین: چەند دەنگێکی زمان هەن بەپێی ژینگە دەنگسازیەکە دەخلیسکێن بەرەو یەکێك لە ئەو و دوو دیوە. لە ڕاستیدا، ئەوەی گوترا لە هەموو زمانەکاندا زۆر بە جوانی و بە وردی باس کراوە، بەڵام بەلای ئێمەوە گرنگ ئەوەیە کە پۆلێنکردنێکی نوێ بخەینە ڕوو، وەك لە سەر نەخشەی (١:٧) روونکراوەتەوە. لە ئەو نەخشەیەدا، سێ جۆر لە فۆنیم دیاریکراون (بزوێن، نەبزوێن: نیمچەبزوێن). بە راشکاوی، نیمچەبزوێن دوو جۆرن، وەك نووکزمانی /ی/ پشتزمانی /و/. ئەم دوو دەنگە هەر لە رەگێشەوە، واتە لە ناخی بیردا، نیمچەبزوێنن، بەڵام لەسەر زمانی ئاخێوەر ناسنامەیان یەکلایی دەبێتەوە بە دیوی (بزوێن)دا، ئەگەر (سەر)یان بخشێت لە کلکی (نەبزوێن)، یان بە دیوی (نەبزوێن)دا ئەگەر (سەر)یان

نەخشێت لە کلکی (نەبزوێن). لە وشەیەکی قەتیس و هێمندا، دەنگی (نیمچە بزوێن) هەر یەك دیوی هەیە. لە بەرانبەردا، دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی)[59] دەکەوێتە سەر ئەو ڕەگەزە ڕێزمانیانەی کە لە چالاکی برگەرێژیدا ڕۆلیان هەیە[60] . بە ئەم پێیە، دەنگی/ی/ لە وشەی قەتیس و سەربەخۆدا، وەك (یاد) و (بیر) دوو دیوی سەربەخۆن و هیچ پەیوەندیەك نیە لە نێوانیاندا. واتە، هیچ چالاکییەکی (دیوگۆڕکێ) لە ئارادا نیە[61] . بۆ نموونە، لە وشەیەکدا وەك (یاد) هیچ ژینگەیەکی دەنگسازی نیە کە بتوانێت دیوە (نەبزوێن)ەکە بگۆڕێت بۆ دیوی (نەبزوێن). هەر لەبەر ئەوە، دەنگی/ی/ لە ئەو وشانەدا دەشێت بە فۆنیمی سەربەخۆ دابنرێن، نەك بە (نیمچە بزوێن). بەرانبەر بە ئەم بۆچوونە، ڕەنگە کەسانێك هەبێت، کە بڵێن: ئەدی دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) لەکوێدایە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو دیاردەیە لە وشەی قەتیس و خاوەن برگەی تەواودا هەبوونی نیە، بەڵام لە ڕەگەزێکی ڕێزمانیدا هەیە کە برگەکەی ناتەواو بێت[62] .

| | | |
|---|---|---|
| | نیمچەبزوێن | |
| | /ی/ + /وو/ | بزوێنەکان + |
| + نەبزوێنەکان | /ی/ + /و/ | |

نەخشەی (١:٧): پۆلێنکردنی فۆنیمەکان بۆ (بزوێن، نەبزێن، نیمچەبزوێن).

---

[59] دیاردەی (نیمچەبزوێنایەتی) بریتیە لە ئەو داینامیزمیە کە دوو دەنگ هەن، لە جەشنی (ی، وو)، کە دەتوانن خۆیان بلوێنن لەگەڵ (بزوێن) و (نەبزوێن)دا، لەگەڵ (بزوێن)دا خۆیان دەکەن بە (نەبزوێن) و لەگەڵ کلکی (نەبزوێن)دا خۆیان دەکەن بە (بزوێن).

[60] زاراوەی (برگە وە ڕێژی) بە واتای دووبارە دارشتنەوەی جێوەی برگە هاتوە. لە ئەم ڕووەوە، ئێمە بیروبۆچوونی خۆمان هەیە لە ژمارە (١٩٩٨/٧٦)ی گۆڤاری (مەتین)دا بلاوکراوەتەوە و تا ئێستا دەیان نووسین و کتێبمان لە سەری نووسیوە.

[61] زاراوەی (دیو) بۆ هەر دوو دیوەکەی (نیمچە بزوێن) دانراوە، واتە دیوی (بزوێن) و دیوی (نەبزوێن).

[62] برگەی ناتەواو ئەو برگەیەیە کە گرێی دەنگسازی (نەبزوێن، بزوێن)ی تێدا نەبێت. جۆرە برگەی ئاوها هەر لە وشە ڕێزمانیەکاندا هەیە.

**٣،٧- بڕگەی ناتەواو و نیمچە بزوێنایەتی:**

بڕگەی تەواو ئەو بڕگەیەیە کە لە خانەی بەراییدا دەنگێکی (نەبزوێن) هەیە و لە خانەی ناوەندیدا دەنگێکی (بزوێن). بێ گومان، لە نێوان ئەو دوو دەنگەدا (گرێی دەنگسازی) ساز دەبێت و بڕگەیەك دروست دەبێت کە بە دەربەندی زاردا تێ دەپەڕێت بە جوانی و بە دروستی، وەکوشەی (باداوە) کە لە سێ بڕگەی سووك پێکهاتوە:

(باداوە) ← (با|دا|وە) ← CVo|CVo|CVo

بەرانبەر بە بڕگەی چێوە تەواو، بڕگەی چێوە ناتەواو هەیە، کە تێیدا (گرێی دەنگسازی) چێ نەبوە و زەبری بزوێنەکە ئەکتیڤە. بۆ نموونە، جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ی) لە سێتە جێناوی (م. ت. ی. مان. تان. یان) لە یەك دەنگ پێك هاتوە و بڕگەیەکی سووکی ناتەواوی هەیە بە هێمای (QVo). ئەو تاکە دەنگەیش ناتوانێت (گرێی دەنگسازی) چێ بکات بە تەنها. هەر لەبەر ئەوە، دوو باری شیاو پەیدا دەبێت، وەك:

**یەکەم:** ئەگەر لە گیرفانی دامێنی بڕگەی پێشەوەدا دەنگێکی (نەبزوێن) هەبێت، وەك /ڵ/ ، ئەوا ڕای دەکێشێت و دەی خوازێت بۆ خۆی، بۆ ئەوەی ناتەواوییەکەی بۆ پڕ بکاتەوە و بڕگەکەی ببێت بە بڕگەی سووکی تەواو، بە هێمای (CVo)، وەك:

هەڵ: ی: دا ← هە: ڵی: دا

CVc + QVo + CVo → CVo + CVo + CVo

بە سەرنجێکی ورد، بڕگەی (هەڵ)، بە هێمای (CVc)، دەنگی /ڵ/ی داوە بە بڕگەی ناتەواو (ی: QVo) و دوو بڕگەی چێوە تەواو پەیدا بوە لە چەشنی (هە: CVo) و (ڵی: CVo).

**دووەم:** ئەگەر گیرفانی دامێن لە برگەی پێشوودا چۆڵ بوو، ئەوا دەنگی نیمچە بزوێنی/ی/ دەبێت خۆی بلوێنێت و خۆی بخات بە دیوی (نەبزوێن)دا. بۆ ئەوەی کێشەی دەنگسازی پەیدا نەبێت، وەك:

دا: ی: دا ← دای: دا

CVo + QVo + CVo → CVc + CVo

بە سەرنجێکی وردتر، دەبینین کە برگەی (دا: CVo) پێشوازی کردوە لە برگەی ناتەواو (ی: QVo)، بۆ ئەوەی خۆی بخات بە دیوی (نەبزوێن)دا و بچێتە نێو گیرفانی دامێن. بە ئەم کردەومیەیش برگەی (دا: CVo) دەگۆڕێت بۆ (دای: CVc) و برگەکەی جێناوی (ی) بە (بۆش) دەمێنێتەوە و لە ریزی گرفتاردا ون دەبێت. بە ئەم چەشنە، برگەی ناتەواو دەبێت بە دەستەماشەیەکی بەکار و چالاك بۆ ڕوونکردنەوەی دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی). کەواتە، دەتوانین بڵێین: (نیمچە بزوێن) بریتیە لە ئەو دەنگەی، ئەگەر سەری خشا لە کلکی (نەبزوێن)ێك بە بزوێنی دەمێنێتەوە و چێوەی برگەکەی دەپارێزێت و ئەگەر نەخشا لە کلکی (نەبزوێن)ێك ئەوا خۆی دەخات بە دیوی (نەبزوێن)دا و برگەکەی لەناو دەچێت. ئەو دیاردەیەیش کە تێیدا دەنگێك بتوانێت دوودیو بێت، واتە جارێك خۆی بخات بە دیوی (بزوێن)دا جارێك خۆی بخات بە دیوی (نەبزوێن)، پێی دەگوترێت (بزاڤی نیمچە بزوێنایەتی).

## ٤:٧- نیمچەبزوێنی پتەو:

لە نێوان ئەو ڕەگەزە ڕێزمانییانەدا کە برگەی ناتەواویان هەیە، دوو کەرستەی ڕێزمانی هەن کە نەفرین دەکەن لە ڕەفتاری (نیمچە بزوێنایەتی). واتە، هەر هەموو ئەو ڕەگەزانە ئەو ڕەفتارە پەسەند دەکەن، بەڵام دوو ڕەگەزی ڕێزمانی پەسەندی ناکەن کە بریتین لە:

یەکەم: ڕەگەزی ناوی واتایی (ی) وەك (جوان: جوانی).
دووەم: ڕەگەزی پەیوەستی، بۆ نازناوی ئاسایی، وەك (هەولێر: هەولێری).

ئەوەی سەیرە، دەنگی/ی/ لە زۆربەی ڕەگەزە ڕێزمانیەکاندا لە هەموو جێیەکدا نەرمە و دەکەوێت بە دیوی (نەبزوێن)دا، کەچی لە ئەو دوو ڕەگەزەدا، ئەوە پەسەند ناکات و داکۆکی دەکات لە سەر پێناسەی (بزوێنایەتی) و ڕەفتاری (نیمچە بزوێن) پەسەند ناکات[٦٢]. ئێستا، چەند نموونەیەك وەردەگرین و ئەو دوو ڕەگەزە دەخشێنین لە کلکی بزوێنەکان، بۆ ئەوەی ڕەفتاری پتەوی ئەم بزوێنە دەربخەین:

| ناوی واتایی | نازناوی شوێن |
|---|---|
| زانا: زانایی | ئەحمەداوا: ئەحمەداوا (یی) |
| کەم ڕوو: کەم ڕوو (یی) | دارەتوو: دارەتوو (یی) |
| زۆر بڵێ: زۆر بڵێ (یی) | قەڵادزێ: قەڵادزێ (یی) |
| پۆشتە: پۆشتە (یی) | سنە: سنە (یی) |
| ڕاستگۆ: ڕاستگۆ (یی) | شنۆ: شنۆ (یی) |

بە سەرنجێکی ورد لە ئەو نموونانە، دەردەکەوێت کە ژینگەی بەرپابوونی (نیمچە بزوێنایەتی) پەیدا بوە، بەڵام نیمچە بزوێنی/ی/ خۆی گرتوە و نەکەوتوە بە دیوی نەبزوێندا. هەر لەبەر ئەوە، ناوگری/ی/ پەیدا بوە و بڕگەکە توانیوەتی بە زاردا تێبپەڕێت. لە ئەم دیاردەیەشدا چەند سەرنجێك هەیە بۆ تۆمار کردن، وەك:
یەکەم: وا دیارە کە ڕەفتاری (نیمچەبزوێن) ئاکارێکی گشتی نەبێت بۆ دەنگی/ی/، چونکە لە ئەو نموونانەدا، بەتەواوی نەفرین دەکات لە ئەو دیاردەیە و ناسنامەی (نەبزوێن) ڕەت دەکاتەوە.

---

[٦٢] ئەم دیاردەیە ئازادییەکی بچووك بەرپا دەکات و لە پاشتردا لێی دەدوێنین و نەختێك لە قاوغەکە دەردەچین.

<u>دوەم</u>: ئەگەر ڕەفتاری (نیمچە بزوێن) بە زۆر چەسپێنرا بەسەر دەنگی/ی/دا، ئەوا باری (نارێك) پەیدا دەبێت.

<u>سێیەم</u>: لە ئەوە دەچێت کە ڕەگەزی (ی)ی جێ مەبەست، لە ڕەسەندا بڕگەیەکی تەواوی هەبێت لە چەشنی (یی: CVo). واتە، لە خانەی بەراییدا/ی/ی (نەبزوێن) و لە خانەی ناوەندا دەنگی/ی/ی (بزوێن) هەڵ بگرێت، وەك:

| سەر | | | | | کلك |
|---|---|---|---|---|---|
| | گ ن | خ ن | خ ب | گ د | |
| | – | /یـ/ | /ـی/ | – | |

<u>چوارەم</u>: بە پێی خاڵی پێشوو، دەشێت لە ئەو نموونانەدا بڕگەی تەواو (یی) لکا بێت بە وشەکانەوە، وەك:

زانا + یی: ( CVo-CVo + CVo)

لە بەرانبەردا، لە ئەو وشانەدا کە بە (نەبزوێن) کۆتاییان هاتوە، هەر ئەو بڕگەیە مابێتەوە، وەك[٦٤]:

هەولێریی: (هەو|لێر|یی): ( CVc + CVc + CVo)

[٦٤] لە ئەم نموونەیەدا، گومان لە ئەوەدا نیە کە دەنگەکە درێژترە و گرێی دروست نەکردوە لەگەڵ دەنگە نەبزوێنەکەدا.

پێنجەم: بەتەریبی لەگەڵ خاڵی پێشوودا، لە دەستەواژەیەکدا، وەك (هەولێری جوان) کێشەکە زۆر جیاوازە، وەك:

هەولێری جوان: (هەو: لێ: ری: جوان):

(CVc + CVo + CVo +c.CVc )

شەشەم: بە بەراورد لە نێوان خاڵی چوارەم و پێنجەمدا، دەردەکەوێت کە گۆکراوی (هەولێری) بە واتای (خەڵکی هەولێر) بە سێ بڕگە گۆ دەکرێت بە ئەم ڕیزە (CVc. CVc. CVo ). لە بەرانبەردا گۆکراوی (هەولێری) لە (هەولێری جوان)دا، هەیە بە سێ بڕگەی تر گۆ دەکرێت بە ئەم ڕێزە: (CVc + CVo + CVo ). واتە، لە گۆکردنی دووەمدا چوار (C) و سێ (V) و دوو (o) هەیە، بەڵام لە گۆکردنی یەکەمدا، پێنج (C) و سێ (V) و یەك (o). ئەمەش بە وردی و بە جوانی ڕەگەزە هورد و نەدیوەکانی جیاوازی دەستنیشان دەکات لە نێوان دوو ڕەگەزی ڕێزمانی جیاوازدا. یەکەمیان ئاکاری (نیمچە بزوێن) پەسەند ناکات و دووەمیان ئەو ئاکارە پەسەند دەکات.

حەوتەم: دەتوانین بڵێین: ئەلبوومی دەنگی/ی/، کە بە بۆیەی (نیمچە بزوێن) ڕووپۆش کراوە، لاپەرەی سپی تێدایە و هێشتا ڕێزمانەکەمان زۆر سادە و ڕواڵەتییە، تۆ بڵێیت، نەتوانین ئەو گلەییە لە زمانانی تریش بکەین؟

هەشتەم: سەرەڕای ئەو دوو ڕەگەزە ڕێزمانیە، پاشگری (ین) هەمان ڕەفتاری هەیە، چونکە بزوێنی /ی/ گشت کاتێك بزوێنە، وەك: (دارین، پۆڵایین، ئاسنین، گڵین، بەردین، مسین، دواین، پاشین، پێشین، ناوین، ...).

## ٥:٧- دیاردەی دروستکردنی بڕگەی لێکدراو:

ئەو بابەتانەی لە پێشەوە باس کران، ئەو کێشانە بوون کە پەیوەندییان هەبوو لەگەڵ خشانی سەری (نیمچەبزوێن) لە دەنگێکی تر. لە ئەم ئاستەدا، بیرۆچکەیەکی جوان پەیدا دەبێت ئەگەر ڕوو بکەین لە دیاردەی خشاندنی کلکی (نیمچەبزوێن) لە دەنگی تر. بۆ نموونە، لە ڕستەیەکدا وەك (ئەو ناردی)، دەنگی/ی/ بزوێنە و ئەگەر بخشێت لە سەری بزوێنی /ە/ لە ڕستەی (ئەو ناردی + ە دەرەوە)دا، ئەوا ڕستەیەك پەیدا دەبێت، وەك: (ئەو ناردیە دەرەوە). لە ئەو ڕستەیەدا، بڕگەی دەنگی نیمچەبزوێنی/ی/، کە بریتیە لە بڕگەی سووکی (دی)، بە هێمای (CVo)، دەگۆڕێت بۆ بڕگەی سووکی لێکدراو (دیە)، بە هێمای (c.CVo). واتە، دەنگی /ی/ کەوت بە دیوی نەبزوێنی/ی/دا و دەنگی /د/یش چوە نێو گیرفانی نووك، وەك: (ئەو ناردیە دەرەوە). گومان لە ئەوەدا نیە کە کەرتی (نارد) بڕگەیەکی گرانی لێکدراو دروست دەکات لە چەشنی (CVcc) و جێناوی (ی) بڕگەیەکی ناتەواو دروست دەکات لە چەشنی ( QVo) و لە ڕستەی (ئەو ناردی)دا بە ئەم چەشنە ئاوێتە دەبن:

ئەو: نارد: ی ← ئەو: نار: دی

$$CVc + CVcc + QVo \rightarrow CVc + CVc + CVo$$

کەواتە، لە کارلێکی یەکەمدا بڕگەی ( CVcc) دەنگی/د/ دەدات بە بڕگەی ناتەواو ( QVo) و بڕگەی (دی: CVo) پەیدا دەبێت. لە کارلێکی دووەمدا، کاتێك کە بزوێنی /ـە/ پەیدا دەبێت، یەکسەر دەخشێت لە دەنگی نیمچەبزوێنی/ی/ لە بڕگەی (دی)دا. لە ئەم هەڵوێستەدا، بڕگەی (دی) دەگۆڕێت بۆ بڕگەی لێکدراو (دیە). بەکورتی، وەك لە خوارەوە کراوە بە ڕێسا، **هەرکاتێك کە سەری بزوێنێك بخشێت لە کلکی دیوی بزوێنی نیمچەبزوێنێك، ئەوا بڕگە ئاساییەکەی دەگۆڕێت بۆ بڕگەیەکی تازە لە چەشنی**

(بڕگەی لێکدراو). ئەو بڕگە تازەیە (د|یە) لە نیمچەی بڕگەیەك و بڕگەیەکی تەواو پێکهاتوە، کە بەیەکەوە نووساون، بۆ ئەوەی بتوانن بەزاردا تێ بپەڕن[٦٥].

دی + ـە ← دیە




## ٦،٧- کێشەی ڕێنووس:

بە سرنجێکی ورد لە هەردوو نیمچەبزوێنەکە، دەبینین کە نیمچەبزوێنی/ی/ لە دیوی (بزوێن)دا و لە دیوی (نەبزوێن)دا هەر بە/ی/ ڕێنووس دەکرێت، کەچی نیمچە بزوێنی/وو/ لە دیوی (بزوێن)دا بە دوو (واو) و لە دیوی (نەبزوێن)دا بە یەك (واو) ڕێنووس دەکرێت. لە (ڕێنووس)ی پیتی لاتینیدا، کێشەکە بە ئەوە چارەسەر کراوە کە هەردوو دیوە نەبزوێنەکە بە (Y و W) دەنووسرێن[٦٦]. لە نووسین بە پیتی عەرەبیدا، چەند خاڵێك هەن و دەبێت تۆمار بکرێن، وەك:

یەکەم: نیمچە بزوێنی/ی/ کێشەی ڕوخساری نیە چونکە لە هەر دوو دیوەکەدا هەر بە/ی/ ڕێنووس دەکرێت.

دوەم: نیمچە بزوێنی/وو/ ئەگەر بە یەك واو ڕێنووس بکرێت لە هەر دوو دیوەکەدا، ئەوا دەکەوین بەسەر هەڵەیەکدا کە (واوی کورت) وەك (کوڕ، کورت) بە نیمچەی بزوێن بناسین، کە وانیە.

سێیەم: هەر دوو نیمچە بزوێنەکە دوو ئەرکی ڕێزمانی بەر بڵاویان هەیە. یەکەمیان/ی/ ڕۆڵی (بار و سەربار) دەگێڕێت و دوەمیان/و/، ڕۆڵی (ئامرازی بەستن) دەبینێت.

چوارەم: بەپێی خاڵی پێشوو، ئەگەر نیمچە بزوێنی/ی/ بە هەمان ڕوخسار بنووسرێت لە هەردوو دیوەکەدا، ئەوا کێشە نیە، وەك دیوی بزوێن: شیر/ی/ پاك.

دیوی نەبزوێن: دۆ/ی/ ترش.

---

[٦٥] لە ئەم جێیەدا، ئەختێك زۆر کراوە لە نموونەکان، ئەویش لە پێناوی تێگەیاندنی بەرانبەردا، داوای لێ بوردن دەکەین.

[٦٦] ئەم جۆرە کێشەیە زۆر باس کراوە و ئەوەی باس دەکرێت زۆر ئاشکرایە وەك لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری زانیاریدا هاتوە.

لە بەرانبەردا، لە نیمچە بزوێنی/وو/دا دەڵێیت سازانێك كراوە، چونكە لە ئامرازی بەستندا، لە هەر دوو دیوەكەدا، هەر بە یەك/و/ دەنووسرێت، وەك:

دیوی بزوێن: من (و) تۆ

دیوی نەبزوێن: تۆ (و) من

پێنجەم: لەبەر ڕووناكی خاڵی پێنجەم، دەبا نموونەی یەكەم بە دوو (واو) ڕێنووس بكرابا، چونكە لەباری ئاساییدا هەر ئاوها تۆمار دەكرێت وەك (كووڕ، سووك، پووش.. هتد).

## ٧:٧- بەرهنجام و پوختەكاری:

- دەنگی نیمچە بزوێن (وو، ی) لەنێو وشەی ڕۆنراودا بە دیوێكدا قەتیس بوە و ئەم دیوە بە ئاسانی ناگۆڕێت. لە ڕاستیدا، دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) تەنها لە ڕەگەز ڕێزمانیەكاندا هەیە. بێ گومان، ئەو ڕەگەزانەی كە چێوەی (بڕگەی تەواو)یان نیە.
- نیمچە بزوێن وەك بە ناوەكەیدا دەردەكەوێت لە ڕەسەندا لە (بزوێن)ێكی مەرجدار دەچێت، بە ئەو مەرجەی كە سەری بخشێت لە كلكی (نەبزوێن)ێك. ئەگەرنا، وەك (نەبزوێن)ێك سەودای پێ دەكرێت لە بڕگەسازیدا.
- لە هەندێك ڕەگەزی ڕێزمانیدا، هەر چەند كە بڕگەكەیش ناتەواو بێت، بزوێنەكە بە پتەوی خۆی دەپارزێت و ناكەوێت بە دیوی (نەبزوێن)دا، لە ئەم ڕووەوە، سیمای (گشتایەتی) لەسەر نیمچە بزوێن دەرەوێتەوە. واتە، دەنگی/ی/ هەیە كە (نیمچە بزوێنایەتی) پەسەند نەكات.
- لە زۆر جێدا كاتێك كە بزوێنێك دەخشێت كە كلكی نیمچە بزوێن، ئەو دەنگە خۆی دەپارێزێت خۆی ناخات بە دیوی (نەبزوێن)، چونكە لەگەڵ نەبزوێنەكەی تردا

**گرێی جووتەدەنگی دروست کردەوە. لە ئەم جۆرە هەڵوێستەدا، نیمچەبزوێنەکە دەکەوێت بە دیوی (نەبزوێن)دا و بڕگەکە دەکات بە (بڕگەی لێکدراو).**

- **لە کێشەی ڕێنووسدا. دەنگی/ی/ کێشەی نیە، بەڵام لە ئاستیدا دەنگی (واو)دا کێشە هەیە، چونکە واوی کورت و واوی درێژ هەمیە.**
- **وەك بەرەنجامێکی پێشکەوتوو، لە کاتی نووسینی ئەم بابەتەدا (١٩٩٩)، وامان دەزانی کە گرێی (جووتەدەنگ)ی نێوان سەری بزوێن و کلکی نەبزوێن، بە لاچوونی هەر یەکێك لە ئەو دوو فۆنیمە، دەبێت بە عەیبدار و ناتەواو. بەڵام ئێستا (٢٠١٥) دەڵێین: بە لابردنی نەبزوێنەکە بڕگەکە دەبێت بە ناتەواو و دەشێت چاك بکرێتەوە، بەڵام بە لاچوونی بزوێنەکە بڕگەکە دەبێت بە (هیچ) و قەوارەکەی خاپوور دەبێت، چونکە خۆی خاوەنی چێوەی بڕگەکەیە و سەرچاوەی وزەکەیەتی.**

## سەرچاوە:

١. د. شێرکۆ بابان، خشتەی لێکدان بزوێنی، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٨.

٢. د. فاروق عومەر سدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی دوەم، بەغدا ١٩٧٥.

٣. مەسعوود محەمەد، بیروبۆچوونەکانی مامۆستا لە هەڵسەنگاندنی سەرچاوەی (٢)دا.

٤. مەسعوود محەممەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٧٣

٥. د. ڕەحمان اسماعیل، بڕگە و ئاسان بوونی بڕگە لە کوردیدا، نامەی ماجستێر زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩١.

٦. د. تالیب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆژی کوردی و ئاسان بوونی بڕگە لە زاری سلێمانیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٩.

٧. د. محەممەد معروف فەتاح، نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورد، ژمارە (٩)، ساڵی ١٩٨٢.

# بابەتی هەشتەم

# کێشەی ڕێنووسی دەنگی (واو)ی درێژ[٦٧]

## ٨:١- دەستپێك:

یـەکێك لـە ئـەو کێشـانەی زمـانی کـوردی کـە بـەجوانی و بـە دەسـتی وەسـتایی چارەسـەر کرابێـت بریتیـە لـە ڕێنووسـەکەی. ئـەو ڕێنووسـەی کـە بـە ڕێنووسـی فـۆنیمی ناسراوە و کە گرافیمێکی تـەرخان کـردوە بـۆ هـەر دەنگێـك کـە نرخـی خـۆی هـەبێت لـە گۆکردنـدا. لە ڕاستیدا پایەبەرزی کورد (تۆفیق وەهبی) زۆر بە هوردی و زۆر بـەرژدی بـە نێو ئەو ئارێشە دژوارەدا هەنگاوی کردوەتەوەو خەباتی کردوە، لـە پێنـاوی ئـەو ئامانجـەدا کە ڕێنووسی زمانەکە زۆر زۆر سەرکەوتوو بێت و کاریگەریی خۆی دەر بخات لە فێربـوون و لـە فێرکردنـدا. تەنانـەت، زۆر جـار منـداڵان دەتـوانن نووسـینی کـوردی بخوێننـەوە بـە مەرجێك ئەگەر دەنگەکانیان خوێندبێت و ڕوخساری دەنگەکان بناسـنەوە. واتـە لـە پـۆلی یەکەمی سەرەتاییدا، بە بڕشتی کتێبە ڕەنگین و سەنگینەکەی مامۆستا (ئیـبڕاهیم ئـەمین باڵـدار)، دەتـوانن بـە (حینجـە) هـەر نووسـینێکی کـوردی بخوێننـەوە، ئەگـەر لـە ڕووی ڕێنووسی فۆنیمیەوە لەنگ نەبێت. هۆی ئـەوەیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو ڕاسـتییەی کـە بـۆ هـەر فۆنیمێـك (phoneme) گرافیمێـك (grapheme) دانـراوە[٦٨]. کەواتـە، دەنگـەکانی زمـانی کـوردی هـەر هـەموویان (بنجـی)ین و لەیـەك ئاسـتدان و (فـرە ئاسـتی) نیـە لـە گۆکردنیانـدا. بۆ بەراود، لە زمانی ئینگلیزیـدا بەرانبـەر بـە جێنـاوی کەسـی یەکـەمی تـاك (من) پیتی (I) دانراوە و ئەم کردارەیش چەند ئاڵۆزییەکی پەیدا کردوە وەك:

---

[٦٧] گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٧٩)، ساڵی ٢٠٠٢، لاپەڕە (٢٢٢-٢٢٤)

[٦٨] لە هەندێك باردا، ئەلەفۆن لە جێی فۆنیم تۆمار دەکرێت. بۆنموونە، دەنگی /ش/ و /س/ لە (کوشتن) و (گاستن)دا، ئەلەفۆنن بۆ هەردوو فۆنیمی رەسەن /ژ/ و /ز/.

**یەکەم:** لە ریزی نووسیندا پیتی (I) بە ناوەکەی خۆی دەخوێنرێتەوە، کەچی دەنگەکانی دی بە فۆنیم دەخوێنرێنەوە. ئەمەیش وەك ئەوە وایە وێنەیەك لە جێی وشەیەك لە ڕیزی نووسیندا دانرابێت.

**دووەم:** ئەگەر جێناوەکە بە مۆرفیمی کوردی بنووسین، سێ دەنگ ڕیز دەبن وەك (ئای) کە دوانیان نەبزوێنە و یەکیان بزوێنە و ئەو سێ دەنگە برگەیەکی پڕ (CVc) پێکدەهێنن. واتە، سەری بزوێنی /ا/ لکاوە بە کلکی هەمزەوە و جووتەدەنگی |ئا|ی بەرهەمهێناوە، پاشان دەنگی /ی/ لە گیرفانی دامێندا ئاکنجی کراوە، وەك هەر نەبزوێنێکی پەراوێزی.

**سێیەم:** لە ڕێنووسی زمانی ئینگلیزیدا نیگاری دەنگی (I) لە واتای جێناوی (مـن)دا، قفل دراوە بە دیوی کەپیتاڵدا و دیوی سمۆڵی لابردراوە.

بێگومان، ئەم هەموو گەنگەشەیە بە ئەوە چار دەکرێت کە هەرسی فۆنیمەکەی جێناوی (I) ڕێنووسی کرابان، وەك لە زمانی کوردیدا ڕێنووس دەکرێت بە (ئـای). سەبارەت بە ڕێنووسی زمانی کوردی، ئەم کێشەیە بە جوانی و بە وردی هەر لە دەسپێکەوە چارەسەر کراوە و هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ دەرنەکەوتوە کە بە قەبارەی ئەو کێشەیە بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، وردە ئارێشە هەر هەیە، بەڵام هەندێك کێشە لەپاش دەیان ساڵ دەردەکەوێت. یەکێك لەئەو کێشانە بریتیە لە ڕێنووسی دەنگی (واوی درێژ) بە یەك (واو) لە باتی دوو واو /وو/. لە ڕاستیدا، ئەم کردەوەیە لە ئەم دەساڵەی دواییدا پەرەی سەندوە لە چاپەمەنیی کوردیدا. ئێمەیش لەئەم نووسینەدا ڕوو دەکەین لە ئەم کێشەیە و بنج و بناوانی دیاری دەکەین و ئەو هۆیانە دەستنیشان دەکەین کە ئەم درزەیان پەیدا کردوە لە دیواری ئەو ڕێنووسە بلیمەتەدا کە پتر لە سێچارەکە سەدەیە لە بەکارهێناندایە و هێشتا هیچ ساتمەیەکی ئەوتۆی نەکردوە.

## ٢:٨- شرۆڤەکاری:

لە ئاستی شرۆڤەکاریدا، دەتوانین هەر دوو بزوێنی/و/ و/ی/ وەربگرین و بەراوردیان بکەین، بۆ ئەوەی کە سەرەداوی گلۆڵە ئاڵۆزکاوەکە بدۆزینەوە. لە یەکەم هەنگاودا، جۆرەکانی هەدوو بزوێنەکە دەخەینە ڕوو، وەك:

**یەکەم:** بزوێنی/ی/ لە زمانی کوردیدا بە دوو فۆنیم خۆی دەنوێنێت:

- فۆنیمی (یی)ی درێژ، وەك (شیر، دیل، بی، ...تاد)
- فۆنیمی (یی)ی قەڵەو، وەك (شێر، دێ، وێڵ ...تاد)

**دووەم:** نیمچە بزوێنی/و/ لە زمانی کوردیدا بە سێ فۆنیم خۆی دەنوێنێت:

- فۆنیمی واوی کورت لە چەشنی (ژێر) یان (زەممەی عەرەبی)، وەك (کوڕ، دوڕ، دوگ، ... تاد).
- فۆنیمی واوی درێژ لە چەشنی واوی عەرەبی، وەك (کووڕ، پووش، دوو، زوو، ڕوو، سوور، ... تاد).
- فۆنیمی واوی قەڵەو، وەك (کۆڕ، مۆڕ، بۆر، گۆ، تۆ، دۆ، ...تاد).

ئێستاش دەتوانین ئەو فۆنیمانەی سەرەوە لە خشتەیەکدا کۆ بکەینەوە، نەخشەی (١:٨).

| دەنگ | کورت | درێژ | قەڵەو |
|---|---|---|---|
| دەنگی (یی) | ........ | ی (سی) | ێ (سێ) |
| دەنگی (واو) | و (کوڕ) | وو (کووڕ) | ۆ (کۆڕ) |

نەخشەی (١:٨): جۆرەکانی بزوێنی (یی) و (واو).

لە ئەو نەخشەیەدا چەند سەرنجێك هەیە و دەشێت تۆماریان بکەین:

**یەکەم:** دەنگی (یی) دوو دیوی هەیە، وەك (درێژو قەڵەو) کەچی دەنگی (واو) سێ دیوی هەیە وەك (کورت و درێژ و قەڵەو). کەواتە، دەنگی (یی-ی کورت) نرخی بۆ دانەنراوە، چونکە نموونەی بەرچاوی نیە لە زمانەکەدا.

**دوەم:** نموونەکانی (سی) و (سێ) دوو نموونەی جوداکەرەوەی بەهێزن و نرخی هەردوو (یی-ی درێژ) و (یی-ی قەڵەو) دەردەخەن. لە بەرانبەردا، نموونەکانی (کوڕ) و (کووڕ) و (کۆڕ) سێ ئەندازەی بەکارن، بۆ نرخی هەرسێ دیوەکەی دەنگی بزوێنی (واو).

**سێیەم:** لەبەر رووناکی خاڵی دوەم، هەرسێ دیوەکەی دەنگی (واو) و هەردوو دیوەکەی دەنگی (یی) دەبێت ڕێنووسیان هەبێت و دەستدرێژی نەکرێتە سەر قەوارەی گرافیمەکانیان. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێك ویستی دەنگی (واوی درێژ) بە یەك (واو) بنووسێت، ئەوا لەئاستی وشەی (کوڕ) و (کووڕ)دا دادەمێنێت، چونکە ئەو (کووڕ) دەنووسێت کەچی دەبێت بە (کوڕ)، ئەوەیش شتێکی ئاشکرایە کە ئەم جووتۆکە کەمینەیە دوو وشەی سەربەخۆن و دوو ڕێنووسی جودایان پێویستە تا واتایان بپارێزرێت لە ئاخاوتن و لە نووسیندا.

**چوارەم:** سەبارەت بە (میکانیزمی نیمچە بزوێنایەتی)، ئەم دیاردەیە تەنیا (واوی درێژ) و (یی-ی درێژ) دەگرێتەوە. واتە بزوێنی واوی درێژ و (یی)ی درێژ دەگۆڕین بە نەبزوێنی (واو) و (یی) لە (هەوار، نەیار)دا. بەڵگەیش بۆ ئەمە بریتیە لە هەندێك ڕەگەزی ڕێزمانی کە بە (بزوێن) و بە (نەبزوێن) دەردەکەون. بۆ نموونە، ڕەگەزی ڕابردووی تەواو (و) بە هەردوو دیوەکەدا دەردەکەوێت، وەك (کەوتوو) و (وەستاو). لەیەکەمدا، دەنگی بزوێنی واوی درێژ/وو/ ئاشکرایە، کەچی هەمان دەنگ لە پاش بزوێنی /ا/ لە نموونەی (وەستاو)دا بوە بە نەبزوێنی/و/. یان، لە جێناوی کەسی سێیەمدا، وەك (ناردی) و (هێنای) دەنگی (یی-ی درێژ) گۆڕاوە بۆ دەنگی نەبزوێنی/ی/.

**پێنجەم:** لە بەرەنجامی خاڵی پێشوودا، دەردەکەوێت کە دەنگی/وو/ لە دیوی نەبزوێندا، دەبێت بە یەک واو/و/ کەچی دەنگی/ی/ لە هەردوو نموومەی (ناردی و هێنای)دا هەر بەیەک ڕوخسار تۆمار دەکرێت. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە (یی-ی کورت) لە ئارادانیە تا (یی-ی درێژ) بە دوو (یی) بنووسرێت. کەچی لە دەنگی /و/دا، دەنگی (واوی کورت) لە ئارادا هەیەو هەر لەبەر ئەوە (واوی درێژ) بە دوو واو تۆمارکراوە.

## ٣:٨- گەماڕۆدانی کێشەی دەنگی/و/:

لە ئەو بابەتەدا کە لە پێشتردا باس کرا، چەند ڕاستیەک دەرکەوتن، وەك:

**یەکەم:** دەنگی/و/ بە سێ فۆنیم دەردەکەوێت کە بریتین لە (و، وو، ۆ) و ئەم سێ فۆنیمە نرخی خۆیان لە ئەم نموونانەدا دەدۆزنەوە (کوڕ، کووڕ، کۆڕ).

**دووەم:** کێشەی نیمچە بزوێن تەنیا لە ئاستی واوی درێژ/وو/دا بەرجەستەیە.

لە گەڵ ئەمەشدا، دەنگی واوی قەڵەو (ۆ) کێشەی نیەو دەتوانین لە ئەم نووسینەدا بێبایەخی بکەین. لە ڕاستیدا، ئەو کێشەیەی کە سەری هەڵداوە، تەنیا هەر لە نێوان بزوێنی واوی کورت و واوی درێژدا پەیدا بوە. واتە، نووسەران دەست درێژی لە (واو)ی کورت دەکەن و ئەرکی واوی درێژیشی پێ دەسپێرن. لە پاش لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە، بۆمان دەرکەوت کە ئەم کێشەیە بە ئەم شێوەیە پەیدا بوە:

**یەکەم:** بە هۆکارێکی ئامارییانە دەنگی واوی کورت/و/ بڕشتی زۆر کەمترە بە (ئامار) بەرانبەر بە دەنگی واوی درێژ/وو/. بۆ نموونە، لەلاپەڕەیەکدا لەوانەیە چەندین واوی درێژ/وو/ هەبێت و لەوانەیە تەنیا یەك نموونەی واوی کورت نەبێت. کەواتە، درزێکی بچووك کەوتوەتە نێو ڕێنووسەکەوە و دەبا دڵسۆزانی ڕێنووسی کوردی لەسەرەتاوە ئەم ئامارەیان بۆ کردبا و ڕەچاوی پاشەکەوتی وزەیان کردبا و دەنگی واوی درێژیان بەیەك

واو/و/ بنووسیبا و ڕوخسارێکی دیبان بۆ دەنگی واوی کورت دابنابا. لە ئەم کردەوەیەدا، لە ئاستی هەر واوێکی درێژ /وو/، روخساری واوێك پاشەکەوت دەکرێت.

دووەم: دەنگی واوی درێژ/وو/ میکانیزمی (نیمچە بزوێنایەتی) لەسەر دەگەڕێت و لە جێیەکدا کە (بزوێن) بێت بە/وو/ دەنووسرێت وەك (کەوتوو، نووستوو، مردوو ...تاد) و لە هەر جێیەکدا کە (نەبزوێن) بێت، بەیەك (واو) دەنووسرێت، وەك (وەستاو، رووخاو، نەماو، سووتاو، بڕژاو... تاد). بێگومان، ئەم بێ بارییەی هەمان ڕەگەزی ڕێزمانی (نیشانەی ڕابردووی تەواو) وای کردوە کە لە گیانی نووسەراندا هەڵوێستێکی نوی پەیدا بێت بۆ لابردنی ئەودوو بارییە.

سێیەم: لەسەر ئەندازە و بەپێوانەی دەنگی /یی/، هەر دوو خاڵی پێشوو زۆر بتەوتر دەبن، چونکە لە خاڵی یەکەمدا دەنگی /یی/ی کورت نیە و هەموو دەنگەکان درێژن و هەر ئامارێك ئەنجام بدرێت و دەنگی (یی)یش بکەوێتە بەر (نیمچە بزوێنایەتی)، هەر بە یەك (یی) دەنووسرێت. بۆ نموونە، جێناوی/ی/ لە دیوی (بزوێن)دا، وەك (ناردی، بردی، کوشتی، خستی، سووتاندی ... تاد)، یان، لە دیوی (نەبزوێن)دا، وەك (هێنای، پێوای، پێکای، کێڵای ... تاد)دا هەر بە یەك (یی) دەنووسرێت. کەواتە، لەسەر ئەندازە و پێوانەی دەنگی /یی/ هەندێك لە نووسەران و ڕۆژنامەنووسان و مامۆستایانی زانکۆ[69] جارێکی دی ڕوخساری دەنگی واوی درێژ ئارایشت دەکەنەوە.

چوارەم: دەنگی واوی درێژ تاکە فۆنیمە کە بە دوو گرافیمی دووبارە /وو/ ڕێنووسکراوە. واتە، نامۆیە لە بەرچاوان و یەکجار زۆریش بەکار دەهێنرێت. هەر لەبەر ئەوە، دەویسترێت ئەم گرافیمە نامۆیە یەك بخرێت لە گەڵ ئەوانی تر و بە دوو واو ڕێنووس نەکرێت.

[69] لەناو ئەو مامۆستایانەدا هەیە پلەی (پرۆفیسۆر)ی هەیە لە زمانی کوردیدا.

## ٤:٨- بەرەنجام و لێکدانەوە:

- هەر چەندە هەندێك لە نووسەران دەستیان کردوە بەگۆڕینی بزوێنی/وو/ بە بزوێنی/و/، بەلام بزوێنی/و/ نرخی خۆی هەیە و ناشێت وا بەناهەق دەستدرێژیی لێ بکرێت. ئەدی، چۆن بتوانین وشەی (کوڕ) لە وشەی (کووڕ) جودا بکەینەوە و بنەمای جووت وشەی کەمینە (minimal pair) بپارێزین.
- ئەو نووسەرانەی کە ئەو کردەوانەیان ئەنجام داوە و بزوێنی واوی درێژیان گۆڕیوە بۆ یەك (واو)، پاساوی خۆیان هەیە، چونکە بزوێنی /و/ مەودای بەکارهێنانی زۆر تەسکەو بە قەبارەی یەك (واو) دەنووسرێت، کەچی بزوێنی/وو/ مەودای بەکارهێنانی زۆر زۆر بەرفراوانەو بە قەبارەی دوو (واو) ڕێنووس دەکرێت. کەواتە، بیردۆزەی (وزە بە فیڕۆ نەدان) خۆی چەسپاندوە و نووسەران لەنگەریان گرتوە و ڕوخسارە کورتەکەیان خستوەتە جێی بەکارهێنانە فراوانەکە. بە واتایەکی دیکە، ڕەخنە لە قەبارەی درێژی گرافیمەکەیە نەك لە خودی فۆنیمەکە خۆی، بەلام ئەو چارەسەرەی کە پەیڕەویان کردوە نابەجێیە، چونکە لە پشت هەر کێشەیەکی ڕێنووسەوە شرۆڤەکاری زانستی پێویستە.
- سەرەڕای ئەو پاساوەی کە لە خاڵی پێشوودا باس کرا، ڕوخسارەکانی بزوێنی/و/ هاوتەریب نابێت لەگەڵ ڕوخسارەکانی بزوێنی/ی/، چونکە (یی-ی کورت) لە ئارادا نیە. نووسەرانیش بە ئەندازەو پێوانەی دەنگی/ی/ ڕوخساری دەنگی/وو/ی درێژیان ڕاست کردوەتەوە، بەلام بە نارەوایی.
- سەبارەت بە ئەو پاساوانەی کە باسکران، نووسەران ئاگایان لە خۆیان نەبوە کە ئەو کردەوەیان ئەنجام داوە، بەلام بیردۆزەی کات بەفیڕۆ نەدان و بیردۆزەی ئەندازەکێشی خۆی چەسپاندوە. کەواتە، لە کاتی خۆیدا، واتە لە کاتی دانانی ئەو گرافیمانەدا، دەبا ڕەچاوی ئەو تیۆرییە بکرابا.

- بەپێی ئەوەی گوترا، درزێکی بچووک کەوتووتە نێو ئەلبوومی دەنگی (واو)ەوە. لە ڕاستییدا، ئەو ئەلفوبێیە هەندە بلیمەتە و هەندە بە کارامەیی بە دەستی وەستایانە دانراوە، لە پاش دەیان ساڵ ئەو کەلێنە بچووکەی تێکەوتوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، هێشتا پاساو هەیە بۆ لا نەبردنی گرافیمی (وو).
- وەك واوی کورت/و/ بەرەوی زۆر کەمترە، دەبا هەر لە سەرەتاوە گرافیمێکی دیکەی بۆ دانرابا. بۆ نموونە، ئەگەر کێشەی واوی کورت ڕەچاو بکرابا و واوی درێژ بەیەك واو/و/ ڕێنووسکرابا، ئەوا ئێستا ئەم کێشەیە سەری هەڵ نەدەدا، چونکە ڕوخسارە ئاساییە کورتەکە بەکاردەهێنرا بۆ بەکارهێنانە فراوانەکە و ڕوخسارە ناساییە درێژەکە بەکار دەهێنرا بۆ بەکارهێنانە بەرتەسکەکە.
- بەپێی ئەوەی باسکرا، درزێکی بچووك هەیە و پاساویش هەیە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو درزە. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو درزە قەوارەی چەندین وشەی واتادار تێك دەدات. هەر لەبەر ئەو هۆیە، پێویستە کە دەزگا باڵاکانی زمان بڕیاری لەسەر بدەن، چونکە بە ئاشکرایی، لە زمانی نووسینی ئەمڕۆدا کێشەی دروست کردوە و هەندێك لە نووسەران و مامۆستایان لە خۆڕا گرافیمی (وو) یان کردەوە بە/و/.
- جوانترین و کاریگەرترین چارەسەریش ئەوەیە کە دوو پیتی تاکگرافیمی جیاواز (نەك جووتگرافیم وەك /وو/[70]) دابنرێن بۆ واوی کورت و بۆ واوی درێژ. لەئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر دەنگی واوی درێژ بەیەك واو/و/ ڕێنووس بکرێت، دەشێت و دەبێت گرافیمێکی سەربەخۆ بۆ واوی کورت دابنرێت، چونکە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لە چەندین وشەی واتاداردا.

[70] لە زمانی نووسینی ئێستادا، هیچ فۆنیمێکی تر نیە کە بە جووت گرافیمی دووبارە ڕێنووس کرابێت، وەك /وو/. هەر لە بەر ئەوە زۆر بە نەشاز و نارێك خۆ دەنوێنێت لە بەرچاو.

**٥:٨- بەرەنجامی پێشکەوتوو:**

بە گوێرەی بنەمای جووت وشەی کەمینە (minimal pair)، دەبێت دوو گرافیم هەبێت بۆ جودا کردنەوەی وشەی (کوڕ) لە وشەی (کووڕ)[٧١]. بێگومان، ئەم بنەمایە بێ دوور نیە و مامۆستایانی ڕێزمان لێی تێ دەگەن، چونکە لە ڕێزمانی سەرتاسەریدا پیادەکراوە. لە دژئاراستەدا، لە هەندێك نموونەدا گرافیمی (وو) بە ناڕەوا بەکار دەهێنرێت، چونکە (زەبری بزوێن) دەچەسپێت بە سەر کلکی بزوێنی /وو/ی درێژەدا و دەی گۆڕێت بە (واوی نەبزوێن) و ئەم جۆرە (واو)ەیش بە یەك واو /و/ ڕێنووس دەکرێت. بۆ نموونە، کاتێك کە بزوێنی /ـە/ دەخشێت لە کلکی بزوێنی/وو/ لە ئەم ڕستانەدا (ڕۆیشتووە، ئەم نادووە، چووە دەرەوە، بووە ئاو) دەبێت بە یەك واو/و/ تۆمار بکەین، وەك: (ڕۆیشتوە، ئەم نادوە، چوە دەرەوە، بوە ئاو)، چونکە زەبری بزوێنی /ـە/ دەنگی نیمچەبزوێنی /وو/ی گۆڕیوە بۆ نەبزوێنی /و/. بە هەمان شێواز، کاتێك کە بزوێنی /ا/ دەخشێت لە کلکی بزوێنی/وو/، لە ئەم نموونانەدا (هەمووان، دەربازبووان، خوالێخۆشبووان)، وەر دەچەرخێت بۆ یەك واو/و/، وەك: (هەموان، دەربازبوان، خوالێخۆشبوان)، چونکە لە ئەم نموونانەیشدا زەبری بزوێنی /ا/ دەنگی نیمچەبزوێنی /وو/ی گۆڕیوە بۆ نەبزوێنی /و/. لە ڕاستیدا، هەر کاتێك کە سەری بزوێنێك، وەك /ـە/ و /ا/، بە ڕاستەوخۆیی بخشێت لە کلکی بزوێنی /وو/ دەی خات بە دیوی نەبزوێندا و بڕگەکەیشی لە جۆری ئاساییەوە (CVo)، لە چەشنی (توو، دوو، چوو، بوو)، دەگۆڕێت بە جۆری لێکدراو (c.CVo)، لە چەشنی (توە، دوە، چوە، بوە، یان: توا، دوا، بوا). ئەم بابەتە لە بەشی پێشوودا باسکراوە و لە ئێرەیشدا کەڵکی لێ وەرگیراوە بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی واوەکان. لە ئامارێکدا کە بە کۆمپیووتەر ئەنجامدراوە، لە ئەم کتێبەی بەردەستدا پتر لە

---

[٧١] بە هەمان شێواز واتاکانی هەندێك وشە لە جووت وشەی کەمینەدا جێلەق دەبن، وەك واتای هەردوو وشەی (قول و قوول)، یان (قولە و قوولە).

(١٥٠٠) گرافیمی دوو واوی هەیە. لە ڕوانگەی تیۆری (زەبری بزوێن)ەوە، بە سەدان نموونەی /وو/ کورت دەبنەوە، چونکە دەبن بە (نەبزوێن) و واوی نەبزوێنیش بە تاکگرافیمی /و/ ڕێنووس دەکرێت. کەواتە، بڕێکی زۆر لە وزە پاشەکەوت دەکرێت. بۆ زانین، ئەم بنەمایە لە ئەم کتێبەدا پەیڕەوکراوە و لە هەر جێیەکدا کە بزوێنی /ـە/ یان بزوێنی /ا/ بە ڕاستەوخۆیی خشابێت لە کلکی /وو/، ئەوا ئەو گرافیمە کراوە بە یەك واو. لە ڕاستیدا، تیۆری زەبری بزوێن بنی زۆر دووره و سیمایەکی سەرتاسەری هەیە و تا لە لای دەنگسازانی ڕۆژئاوا هەرس نەکرێت، لە لای خۆمان نابێت بە بابەت، هەرچەندە بابەتەکە خۆماڵیە و ڕەسەنە و تۆوەکەی لە کێڵگەی زمانی کوردیدا دۆزراوەتەوە.

**سەرچاوە:**

- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، بەغدا ۱۹۲۹.- د. ئەو ڕەحمانی حاجی مارف، نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی، بەغدا ۱۹۸٦.

- د. وریا عومەر ئەمین، فۆنیمەکانی زمانی کوردی، نووسەری کورد، ژمارە (۸)، بەغدا ۱۹۸۲.

- د. محەمەد مەعرووف فەتتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ۱۹۸۷.

- مەسعوود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا ۱۹۷٤.

# لیستی توێژینەوەکان لە بواری ڕێزمانی کوردیدا

١- جێ گۆڕکێی جێناوی لکاو، ڕۆلی بکەر و بەرکار، گۆڤاری کاروان ژمارە (٢)، ١٩٩٢.

٢- بلاوکردنەوەی پوختەی پرۆژەی ، Programmable grammar of Kurdish Language

لە بلاوکراوەکانی زانکۆی ئەمستردام، پەیمانگای مەنتیق و زمان و کۆمپیوتەر، ژمارە (Lp-95-02)

٣- دەنگی خب لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر .١٩٩٧

٤- ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٢٠)، هەولێر .١٩٩٨

٥- بڕشتی خانە ڕێزمانیە بۆشەکان لە نێو بیرداگۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٩)، هەولێر .١٩٩٨

٦- ڕەگەزە ڕێزمانیە ستوونیەکان، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٨)، هەولێر .١٩٩٨

٧- لێکدانەوەی ڕستە بە ژمارە، گۆڤاری (نووسەری نوی)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٨.

٨- پێنج پێشنیار بۆ زمانی ڕۆژنامەگەری، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٠)، هەولێر .١٩٩٨

٩- چێوەی بڕگەی دەنگسازی، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٦)، دهۆك .١٩٩٨

١٠- جێناوی نادیار، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣)، هەولێر .١٩٩٨

١١- کۆلکە ڕێزمانیە دوو ڕەگەزەکان، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٠)، هەولێر .١٩٩٨

١٢-کێشەی کاری (هاویشتن) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٨)، دهۆك .١٩٩٨

١٣- ئامرازی پەیوەندی (ە) ، لە زمانی نووسینداگۆڤاری کاروان، ژمارە (١٢٢)، هەولێر .١٩٩٨

١٤- خشتەی لێکدانی بزوێن ،گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٤)، هەولێر ١٩٩٨.

١٥- شێوەزاری گەرمیان بەبەراورد ، گۆڤاری (هاواری کەرکووك)، ژمارە (١)، هەولێر .١٩٩٨

١٦- پانۆرامای مۆرفیمی ئێستایی (ـە)،گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١١)، هەولێر .١٩٩٨

١٧- کێشەی ڕوخساری جێناو، گۆڤاری (ڕواندز) ، ژمارە (٢)، هەولێر .١٩٩٨

١٨- بەرەو زمانی نووسین، مەکینەی وشە ڕۆنان، گۆڤاری (ڕامان) ، ژمارە (٢٨)، هەولێر .١٩٩٨

١٩- میکانیزمی وەرچەرخان، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨١)، دهۆك .١٩٩٨

٢٠- میکانیزم لە بزاڤی جێگۆڕکێدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٧)، هەولێر ١٩٩٨.

٢١- چەند نهێنیەك لە ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٦)، هەولێر .١٩٩٨

٢٢- کێشەی جێناوی کەسی دوەمی تاك لە زمانی نووسیندا،گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨٣)، دهۆك .١٩٩٨

٢٣- ڕێزمانی پاشکۆی (یەتی)، گۆڤاری (پەیڤ) ، ژمارە (٩)، دهۆك ١٩٩٨.

٢٤- کێشە و کەڵك لە ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاکدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٢)، هەولێر ١٩٩٨، ژمارە (١٣)، هەولێر ١٩٩٩.

٢٥- بڕگەی دووبارە لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨٧)، دهۆك ١٩٩٩.

٢٦- ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٩)، هەولێر .١٩٩٩

٢٧- نەخشەی دابەشبوون لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (١)، هەولێر .١٩٩٩

٢٨- میکانیزمی زەبری بزوێن، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٢)، هەولێر .١٩٩٩

٢٩- دوو ڕەگەزی ڕێزمانی بە بەراورد، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (٢)، هەولێر .١٩٩٩

٣٠- ڕێژەی فەرمان، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٤)، هەولێر .١٩٩٩

٣١- پاشگری دووپات کردنەوە (مەوە) لە شیتەڵکاریدا، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٩٠)، دهۆك ١٩٩٩.

٣٢- گەمەیەك لە گەڵ ئامرازی (ی)دا، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤٠)، هەولێر .١٩٩٩/٨/٢٠

٣٣- دەنگی خپ و دەنگی نیمچە خپ لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٠)، هەولێر .١٩٩٩

٣٤- گەشتێك لە گەڵ جێناوی کەسی سێیەمدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٦)، هەولێر .١٩٩٩

٣٥- جێناوی لکاو بە بەراورد، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٣٩)، هەولێر .١٩٩٩

٣٦- تایبەتمەندێتی لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (بیاڤ)، ژمارە (٢)، هەولێر .١٩٩٩

٣٧- ئامرازی بار و سەربار " ی"، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٥)، هەولێر .١٩٩٩

٣٨- لە ئەلبوومی خلیسکەبزوێندا، گۆڤاری (پەیڤ) ، ژمارە (١٢)، دهۆك ١٩٩٩.

٣٩- جەبر و ڕێزمانی کوردی، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤٨)، هەولێر ١٥/١٠/١٩٩٩

٤٠- واتاسازی لە پاشگری ( ەوە)دا، گۆڤاری ( ڕۆشنبیری کوردستانی)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٩.

٤١- لە پەراوێزی مۆرفیمی ئێستاییدا، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (٣)، هەولێر .١٩٩٩

٤٢- گرێی دەنگسازی، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٩)، هەولێر ١٩٩٩

٤٣- ڕێزمانی ئامرازی گەیێنەر، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە ( ١٥٧ )، هەولێر ١٩٩٩.

٤٤- ئامرازی ئاماژە و ئامرازی گەیێنەر، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٩٥)، دهۆك ١٩٩٩.

٤٥- ئامرازی ناساندن (ەکە)، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٦)، هەولێر .٢٠٠٠

٤٦- پلەی پۆلە جێناوەکان، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٤٢)، هەولێر .٢٠٠٠

٤٧- گەشتێك بە ناو واتای کاری سووتاندا، گۆڤاری ( ڕۆشنبیری کوردستانی)، ژمارە (٢)، هەولێر .٢٠٠٠

٤٨- گەمەبەك لەناو ئامرازەکانی ناساندندا، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٧٣)، هەولێر ٢٠٠٠.

٤٩- ڕوخسارەکانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٣)، هەولێر .٢٠٠٠

٥٠- گەمەیەك لە گەڵ مۆرفیمی بۆشدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٤٤)، هەولێر ٢٠٠٠

٥١- بنجایەتی لە هێزی تێپەڕیندا، ڕێزمانی بنەڕەت، گۆڤاری (رامان) ژمارە ( ٤٧)، هەولێر .٢٠٠٠

٥٢- گەمەیەك لەگەڵ ئامرازی ئاماژەدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٧)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٣- دۆخەکانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٠١)، دهۆك.٢٠٠٠

٥٤- جێناوی سادە و جێناوی ناسادە، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٥٠)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٥- تایبەتمەندی لە جێناوی کەسی سێیەم دا، ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٩٠)، هەولێر ٨/١٨/ ٢٠٠٠.

٥٦- ڕێژەی نائاشکرا لە نیازداری و گوماندارییدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٤٨)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٧- نموونەیەك لە چاکسازی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٨- بەرەو ڕێزمانی برگە ، گۆڤاری ( ڕۆشتبیری کوردستانی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٩- دەنگی /ت/ لە ڕوخساری جێناودا بە بەڵگە، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٥٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦٠- چەند نهێنیەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی(ـە)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦١- ڕێژەی بکەر نادیار و چەند سەرنجێك، گۆڤاری(ڕامان)، ژمارە(٥٥)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦٢- ئامرازی پەیوەندی(بۆ) لە چەند سەرنجێکدا، ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٢١٦)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٣- ڕامانێك لەئاستی ناوی واتایی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٥٧)،، هەولێر ٢٠٠١.

٦٤- سێ میکانیزم بۆ دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٠٩)، دهۆك ٢٠٠١.

٦٥- گەمەیەك لە نێو برگەی دەنگسازیدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٢٠)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٦- گەشتێك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٥)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٧- ڕێزمانی کەرەستەی (هەر) بەلێکدراوی، گۆڤاری (یەکبوون)، ژمارە (١٧)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٨- کەرەستەی (هەر) لە شرۆڤەکاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٥٩)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٩- ئامرازی پەیوەندی لە ئاوەڵگوزارەدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٧) ، هەولێر ٢٠٠١.

٧٠- ڕامانێك لە ئاستی خوێندنی ڕێزمان لە قوتابخانەکاندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧)، هەولێر ٢٠٠١.

٧١- نابووت کردنی ئامرازی پەیوەندی لە زمانی ڕۆژنامەگەریدا، گۆڤاری (ڕۆژنامەوانی)، ژمارە (٥)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٢- ئامرازی پەیوەندی (لە)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦٠)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٣- گەشتێك لە نێو ڕێزمانی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٦٣-٦٤)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٤- کەڵکی ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە وانەی ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٥- واتای گشتی، واتای تایبەتی، واتای خوازراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٦- ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لەشرۆڤەکاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦٢)، هەولێر ٢٠٠٢.

٧٧- زمانی ڕۆژنامەگەری و هەڵسووڕاندنی هەواڵ، گۆڤاری (ڕرۆژنامەگەری)، ژمارە (٩)، هەولێر ٢٠٠٢.

٧٨- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (بە) ، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٣٦)، دهۆك ٢٠٠٢.

٧٩- کێشەی ڕێنووسی واوی درێژ، گۆڤاری ( ڕامان)، ژمارە (٧٩)، هەولێر ٢٠٠٣.

٨٠- مۆرفیمی ئێستایی لە ژێر جێناودا، بە بەڵگە، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٨١)، هەولێر ٢٠٠٣.

٨١- ڕوخساری مۆرفیمی ئێستایی بە بەڵگە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٢١)، هەولێر ٢٠٠٤.

٨٢- ئامرازی بەستن (ی) لە چەند کەمەیەکی شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٨٦\٨٧)، هەولێر ٢٠٠٤.

٨٣- چەند ئەندازەیەك بۆ ناسینەوەی ئاوەڵناو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٤.

٨٤- پانۆرامایەك بۆڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٢)، دهۆك ٢٠٠٤

٨٥- ئاوەڵناو وەك کوانوویەك بۆ ناوی واتایی، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە (٣١)، دهۆك ٢٠٠٤

٨٦- بەڵگەسازی و ئەندازەکاری لە ئاکارەکانی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٩٢)، هەولێر ٢٠٠٥

٨٧- کاری (کردن) بریتیە لە دیوە تێپەڕەکەی (بوونی ڕووداودار)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٣)، هەولێر ٢٠٠٥

٨٨- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاری (هەبوون)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٥)، هەولێر .٢٠٠٥

٨٩- لە ئاکارە ڕەنگینەکانی ڕێزمانی کوردی، گۆڤاری (مێرگ)، ژمارە (٣)، هەولێر .٢٠٠٥

٩٠- بوونی بێ ڕووداو بوونی ڕووداوداربە بەراورد، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٥

٩١- حەشارگەی دەمکاتی ئایندە لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٧)، هەولێر .٢٠٠٥

٩٢- ڕێزمانی کاری (کردن) بۆ مامۆستایانی زمانی کوردی، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٥٨)، هەولێر ٢٠٠٥.

٩٣- جۆرەکانی (بوون) لە ژێر میکرۆسکۆپی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٠٢)، هەولێر ٢٠٠٥.

٩٤- تایبەتمەندی لە ڕەفتاری ئامرازی کۆ (ان)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٩)، هەولێر .٢٠٠٥

٩٥- بزوێنی بزرۆکە /i/ بە بەرجەستەیی لە ڕێنووسدا، گۆڤاری (هزرین)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٥.

٩٦- پەندی (ڕەگ بە ڕەگێشە و گلێخە بە بنە تۆو ) لە تەرازووی زماندا، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٦.

ڕێچکەکانی ڕستەسازی لە کاری بوونی ئێستایی دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٢)، هەولێر .٢٠٠٦

٩٨- وشە ڕۆنان بە بێ ئامرازی ڕێزمانی ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٦.

٩٩- گەمەیەکی هورد و ئاڵۆز لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٠٧)، هەولێر .٢٠٠٦

١٠٠- چەند سەرنجێك دەربارەی کاری بێهێز و کاری ناتەواو، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٤)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠١- گەشتێك بە ناو ڕێزمانی ئامرازی (نەرێ)دا ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر .٢٠٠٦

١٠٢- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی چاوگی (ئاندن)دا ، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە (٣٧)دهۆك ٢٠٠٦.

١٠٣- واتادانەوەی کاری (شکان) لە ئاخاوتنی کوردەواریدا، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٤- چەند وێستگەیەك لە ڕێزمانی ناوەڵناودا ، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٥)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٥- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاری (دان)دا ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٦- بوونی ئێستایی و مۆرفیمی ئێستایی بریتین لە کار بە بەڵگە و بە شرۆڤە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١٠٧)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٧- سێتی ڕێزمانی وەك کەرەستەیەك بۆ فێرکردن لە وانەی ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٧)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٨- پاشگری ناوی بکەر (ـەر) لە شرۆڤەکاریدا ، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٨)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٩- گرنگی وشەی (خۆ) لە ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٩)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٠- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە سێتی ڕێزمانیدا ، گۆڤاری ( نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١١- ئەرك و ریزی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاردا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٢- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاری (هاتن)دا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٥)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٣- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاری (کەوتن)دا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٣٠)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٤- گرنگی (بەرکار) لە ئاستی ڕێزمانی کار و ڕێزمانی چاوگدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٥- پۆلین کردنی تەرزسازییانەی زمانی کوردی، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٥)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٦- ئامرازی (ـە) وەك ئامرازێکی پتەو لە ڕێزماندا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٧- ڕێزمانی پاشگری (ـەر) بە نموونە و بە شرۆڤە، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٥\٧٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٨- ئامرازی (بۆ) و ئامرازی (لەبۆ) بە شرۆڤە و بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٩- دیوە تیۆرییەکانی رێزمانی بەرکاری راستەوخۆ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٠- ماکەکانی شێوەزاری گەرمیان لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٤٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢١- کێشە دەنگسازییەکانی ئامرازی (ــە) لە رێزمانی کاردا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٧)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٢- ئامرازی نیشانە لە چەند ئاڵۆزییەکی رێزمانیدا ، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٣- پاشگری ناوی بکەر (ـەر) پاشگری ناوی بەرکار (راو) بە شرۆڤەو بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٤- لە سیما جوانەکانی شێوەزاری گەرمیان، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٤٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٥- کەرستەی (هی) و کەرستەی (هین) تە شرۆڤەکاری رێزمانیدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٦- کاری ( بریتی بوون لە......) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١٢٥)، هەولێر .٢٠٠٧

١٢٧- کەرستەی (تر) لە روانگەی زمانی نووسینەوە، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٠)، هەولێر .٢٠٠٧

١٢٨- چەند سەرنجێکی زاراوەسازییانە، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣٠)، هەولێر .٢٠٠٧

١٢٩- سۆراخێك بە دوای مۆرفیمی ئێستاییدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٩)، هەولێر .٢٠٠٧

١٣٠- ئاخاوتنی ئزەوزە لە شرۆڤەکاری زانستیدا ، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣١- هەبدێك تایبەتمەندی دەنگسازییانە لە نیشانەکانی رابردوو "د" و "ت"دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣٢- وشەی ریزمانی و وشەی لێکسیکی، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣٣- نیشانەکانی رابردوو و نیشانەکانی جۆری رابردوو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٠)، هەولێر ٢٠٠٨

١٣٤- گوڵبـژێرێك لـه وشـه تایبەتییـەکانی شـێوەزاری هـەولێر، گۆڤـاری (ئاسـۆی فۆلكلـۆر)، ژمـارە (٣٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٥- هەندێك لە لە جۆرەكانی تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٢٣٦)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٦- ڕێساكانی وشەرۆنان لە بنجی كارەوە، گۆڤاری (ئاینده)، ژمارە (٧٨)، سلێمانی ٢٠٠٨.

١٣٧- ڕێزمانی ناو و لاڕێزمانی ئاوەڵنـاو لـە تـەرازووی بـەراوردا، گۆڤـاری (نووسـەری نـوێ)، ژمـارە (٤١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٨- ئامرازی پەیوەندی "بە" لە چەندین بەكارهێناندا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٢٢٩)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٩- كاری ئاراستەدار و كاری ئامرازدار لـە زمـانی كوردیـدا، گۆڤـاری (نەوشـەفەق)، ژمـارە (٥٧)، هـەولێر ٢٠٠٨.

١٤٠- ئەلبوومێك بۆ نیشانەی كۆ "ان" لە ئاخاوتنی كوردیدا، گۆڤاری (پەروەردە و فێركردن)، ژمـارە (١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤١- كارەكانی دەنگی سروشـتی لـە ئاخـاوتنی كوردیـدا، گۆڤـاری (نووسـەری نـوێ)، ژمـارە (٤٢)، هـەولێر ٢٠٠٨.

١٤٢- ڕێزمانی ڕێژەی تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٦٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٣- پێشكاری (بـ) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١٣٨)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٤- ڕێژەی كاری تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا ، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٢٣٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٥- دوو جێناوی لكاو بە بەراورد (-یت) و (-ێت)، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٦- مۆرفیمی ئێستایی بە ئاوێتەیی، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٦٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٧- زمانی کوردی زمانێکی بکەرلەپێش، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٨- زمانی کوردی زمانێکی بکەربەزێن، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٩- زمانی کوردی زمانێکی ئەرگگۆڕ، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٠- زمانی کوردی زمانێکی نووسەکی، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥١- زمانی کوردی و جێگۆڕکێی جێناو، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٢- نیشانەی کۆ (ان) تایبەتمەندی خۆی هەیە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٥)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٣- جێناوی کەسی سێیەم تۆخمی دوور و نزیک هەڵ دەگرێت، زنجیرە زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٧)هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٤- جێناوی کەسی سێیەم وەك باتلۆیەکی ڕێزمانی، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٨)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٥- ئامرازی گەیەنەر لە سەر ئامرازی نیشانە ڕۆنراوە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٩)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٦- ئامرازی ناسراوی (ەکە) دیوی کۆی هەیە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٧- دیاردەی ئەرگگۆڕکێی جێناو، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٨- بووژاندنەوەی دەنگی خپی /ت/، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٩- بووژاندنەوەی دەنگی خپی (ر)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٠- سێتە جێناوی بارگاوی (م، یت، ـە، ین، ن. ن)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٧)هەولێر ٢٠٠٨.

١٦١- نیشانەی نەرێ (نـی)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٢- ریزە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) بارگاوین بە بەرکارێکی نادیار، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٣- سەرکایەتی لە روخساری رستەدا، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٨)، هەولێر٢٠٠٩.

١٦٤- کێشەی نیشانەی رابردوو /ت/، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٠)، هەولێر٢٠٠٩.

١٦٥- ئامرازی پەیوەندی (ە) لە چەند ئالۆزییەکی رێزمانیدا، گۆڤاری (پەروەردەو فێرکردن)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٦- کاری بوونی ئێستایی لە پەرێزی رستەسازیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٣٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٧- پانۆرامایەك بۆ رێزمانی ئاوەڵناو لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (ك ٢١ )، ژمارە (٤)، هەولێر .٢٠٠٩

١٦٨- پانۆرامایەك بۆ واتاکانی کاری (دان) لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٥)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٩- ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە رێزمانی کاری ناسادەدا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (١)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٠- چەند پەراوێزێك لە تەرازووی زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧١- ڕێزمانی ئاوەڵناو بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٣٨)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٢- دیوە تیۆرییەکانی فۆنیم و بڕگەی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٣- نیشانەی نەرێ (نی) لە شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (پەروەردە و فێرکردن)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٤- دیوە تیۆرییەکانی گرێی دەنگسازی بڕگەی ئاخاوتنی کوردی بە نموونە، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٥- ڕێزمانی کاری لێکدراو بە کۆلکەی بەرکار، گۆڤاری (ك ٢١)، ژمارە (٥-٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٦- جیاوازی نێوان ئامرازی کار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٧)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٧- شێرازەی کاری ناسادە، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٤-٥)، هەولێر ٢٠٠٩

١٧٨- ڕێزمانی بکەر و بەرکار لە تەرازووی ڕێزمانی کاردا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤٠)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٩- چەند بابەتێکی ڕێزمانی بە بەراورد، گۆڤاری (پەروەردە و فێر کردن)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٨٠- ئامرازی (ـە) لە بەر زوومی پرسیاردا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٦)، هەولێر ٢٠١٠.

١٨١- ئاستەکانی جیاوازی لە نێوان ڕێزمانی کاری دارێژراو و کاری لێکدراودا، گۆڤاری (ك ٢١)، ژمارە (٧) هەولێر ٢٠١٠.

١٨٢- تیۆری سەرتاسەری ڕوخساری فۆنیم لە ئاخاوتنی کوردییەوە، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠١١.

١٨٣- تیۆری سەرتاسەری گرێی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١١)، هەولێر ٢٠١١.

١٨٤- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی ئاسایی، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٢)، هەولێر ٢٠١٢.

١٨٥- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی لێکدراو، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٣)، هەولێر ٢٠١٢.

١٨٦- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی ناتەواو، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٤)، هەولێر .٢٠١٢

١٨٧- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٥)، هەولێر ٢٠١٣.

١٨٨- تیۆری توانستی بزوێن، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٦)، هەولێر .٢٠١٣

١٨٩ – کتێبی تەمەن (Vowel Power Theory)، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠١٣.

# لیستی توێژینەوەکان لە بواری ئەندازیاری میکانیکدا

## یەکەم: بە زمانی ئنگلیزی:

1. Study of Hard Faced Steels under Thermal and Tribological Strains, Application to Copper- rolling. 4th CONTIROD conference, Ozaka, Japon 1984.
2. Surface Morphology and Contact Nature in Abrasion Processes, Journal of College of Education, University of Salaheddin, vol. 4, 1994.
3. Effect of Low Values of Surface Roughness in Abrasive Wear Mechanism. ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 6, No 2, 1994.
4. Effect of the Flank Wear Land on Cutting Edge Angles in Turning, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 16, No 2, 2004..
5. The Theretical Approach for the Shape and Area of the Flank Wear Damage in Turning. 1st Middle East Conference on Advances in Civil, Mechanical and Material Engineering. Amman- Jordan, 10-13 May 2005.
6. A Reconsideration for the Position of the Cutting Edge in Turning, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 16, No 5, 2005.
7. Response Surface Regression Methodology. Evaluating in Turning 1050 Steel and Hardened Steel, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 17, No 1, 2005.
8. Effect of the Contact Angle between the Cutting Edge and Surface of Cut on the Flank Wear Width in Turning Operations, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 17, No 1, 2005.
9. The Study of Vibration Characteristics in Head Stock of a Lathe Machine at Different Cutting Conditions, ZANKO, Journal of University of Sulaimany, vol. 9, No 1, 2006..
10. Effect of the Tool Nose Radius of Coated Carbides on Surface Roughness in Turning, ZANKO, Journal of University of Slaimany, vol.1 9, No 1, 2007.

11. Improvement in Surface Roughness Quality of Aluminium by the Application of Roll-burnishing, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 19, No 2, 2007.
12. Analytical Aspect of Some Ignorted Parameters Affecting the Flank Wear Land Width in Turning Operations, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol.19, No 3, 2007.
13. The Impact of the Flank Wear Land VB on the Dimensional Deviation of Machined Parts. ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 19, No 4, 2007.
14. Optimum Cutting Conditions and Tool Life for Finish Hard Turning of AISI 1050 steel. ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 21, No 4, 2009.
15. Effect of a Higher Solution Annealing Temperature on the Abrasion Resistance of Duplex Stainless Steel SAF 2304, Journal of (Stainless Steel World), volume 22, May 2010.
16. Evaluation of the Abrasive Wear and Surface Roughness of Duplex Stainless Steel SAE 2304. Journal of (Stainless Steel World), published in Vol. (3), September 2010.
17. Determination of the Height of the Cutting Edge Lost in Wear from the Flank Wear Land VB in Turning Operations. Vol. 3 No. 3 September 2010, (Global Journal of Engineering and Technology).
18. Effect of Conic Head Angle on the Mechanical Properties of Friction Welded Joints of Al Alloy 6063. Vol. 3 No. 4 December 2010, (Global Journal of Engineering and Technology),
19. Effect of Steel Fiber Srengthening on the Mechanical Properties of Friction Welded Joints of Al Alloy 6063. Vol. 3 No. 4 March 2011, (Global Journal of Engineering and Technology).
20. Effect of Welding Temperature on the Hardness and Microstructure of Friction Weld Joints of Aluminum Alloy 6063, published in 5th International Mechanical Engineering Forum, Prague, June 20-22 2012.

**دووەم: بە زمانی فەرەنسی:**

1. Etude dc la resistance a lendommagement des galets de laminoire a chaud., Revue de metallurgie, No 9 80e annee, Paris Septembre 1983.

2. Importance de phenomenes eletrochimique dans lendommagement dun acier peu allie, Proceeding of 9th international congress on metallic corrosion Toraonto Canada, June 3-7-1984 page 171- 176.

3. Etude de lendommagement Sous Sollicitation multiple de super Proceeding of 7th international conference on the alliage recharges. strength of metals and alloys Montréal- Canada 12-16 August 1985 page 1569-1574

4. Etude de levolution micro-structural dun alliage base Cobalt

sollicite en cyclage terminus. SFM - Fatigue a haute temperature, Paris, Jun. 1986.

**سێیەم: بە زمانی عەرەبی:**

١- (تطوير سبائك الالمنيوم المستخدمة في تصنيع مكوك الغزل في مكائن الغزل والنسيج) مجلة زانكو المجلد (٥) العدد (٢)، اربيل ١٩٩٤

٢- (دراسة تأثير الاجهاد المسبق علي مقاومة التآكل الميكانيكي لصلب منخفض الكاربون) مؤتمر جامعة تكريت، ١٩٩٢.

٣- (مدي استخدام رمل ارضم في تهيئة قوالب السباكة بواسطة ماكنة الرج والعصر)، مؤتمر جامعة صلاح الدين، اربيل ١٩٩٣).

## چوارەم: بە زمانی کوردی:

١. پیشەسازی ئەلیکترۆنی و دروست کردنی توێژاڵی سیلیکۆن، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (٢,٣)، هەولێر ٢٠٠٢.

٢. پیسبوونی ژینگە بە دووکەڵی ئۆتۆمۆبیل، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٣.

٣. باری ئەندازیاری لە سیستمی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیلدا، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (٥,٦)، هەولێر ٢٠٠٤.

٤. سیستمی ئەی بی ئێس لە برێکی ئۆتۆمۆبیلدا، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (٧,٨)، هەولێر ٢٠٠٥

٥. سـیرامـک، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠٠٦

٦. گەشتێك بەناو کەرەستە تیژبڕەکاندا، گۆڤاری ( ئەندازیار)، ژمارە (١٢,١١)، هەولێر ٢٠٠٧

٧. هاوکێشەیەك بۆ لێکدانی گشت ژمارەکان، گۆڤاری زانکۆ پرێس، ژمارە (٦)، هەولێر ٢٠١٠

٨. خشتەیەك بۆ لێکدانی گشت ژمارەکان، گۆڤاری زانکۆ پرێس، ژمارە (٧)، هەولێر ٢٠١١.

## کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر لە بواری زمانی کوردیدا:

١- ڕستە سازی و شیتەڵکاری زانستی هەولێر ١٩٩٦.

٢- میکانیزمە بنەڕەتیەکانی ڕستەسازی، هەولێر ١٩٩٧.

٣- داینامیزمی جێناوی لکاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧.

٤- نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی کار، هەولێر ١٩٩٩.

٥- لە مۆرکە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی ، هەولێر ٢٠٠٠.

٦- بەرەو ڕێزمانی کوردی : بەرەو زمانی نووسین، هەولێر ٢٠٠٠.

٧- شرۆڤەکاری ڕێزمانی لە زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٠.

٨- ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ـەوە) ، هەولێر ٢٠٠١.

٩- ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاک، هەولێر ٢٠٠٤.

١٠- دەنگسازی و بڕگەسازی، هەولێر ٢٠٠٥.

١١- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ، هەولێر ٢٠٠٦.

١٢- زمانی نووسینی ڕێزماندار، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣- بەرەو وشەرۆنان لە زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤- هەندێك لە ئاكارە ڕەنگینەکانی ڕێزمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠٠٩ ( نووسینەوەی یەکەم).

The Phonemic Junction Faculty

١٧- بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە، سلێمانی ٢٠١٠.

١٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠. (نووسینەوەی دووەم، پێداچوونەوە و نوێژەنکردنەوە).

The Phonemic Junction Faculty, 2nd edition

١٩- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠.

Engineering Phonology

٢٠- سێ میکانیزمی ڕێزمانی، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠١٢.



٢١- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣.

Vowel Power Theory

٢٢- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣.

Phonetic Engineering

٢٣- ڕێزمانی کاری نادە، هەولێر ٢٠١٤.

٢٤- بەرەو ڕێزمانی ناوەڵناو، هەولێر ٢٠١٤.

٢٥- دەنگسازی زمانی کوردی بە تیۆری زەبری بزوێن، هەولێر ٢٠١٤.

٢٦- بنچینەی زمانی کوردی، هەولێر ٢٠١٤.

٢٧- بڕگەسازیی کوردی لە تیۆری زەبری بزوێندا، هەولێر ٢٠١٤.

٢٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٤.

Syllabification and Re-syllabification Processes

٢٩- ڕستەسازی و شیتەڵکاری زانستی/ نووسینەوەی دووەم / هەولێر ٢٠١٥.

٣٠ - بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٥.

Minimized Phonology and Phonetic System Insertion

٣١- ڕێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەکاری زانستیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٢- بنچینەی دەنگسازی لە ڕێزمانی کوردیدا/ هەولێر ٢٠١٥، (ئەم کتێبەی بەردەست).

| پۆلێنکردنی ستوونی / پۆلێنکردنی ئاسۆیی | برگەی سووک | برگەی پڕ | برگەی گران |
|---|---|---|---|
| برگەی ناتەواو | QVo | QVc | QVcc |
| برگەی ئاسایی | CVo | CVc | CVcc |
| برگـــــەی لێکدراو | c.CVo | c.CVc | c.CVcc |

نەخشەی (٧:٢): پۆلێنکردنی جۆرەکانی برگە

